شانۆگەریی

# وەلی دێوانە و شەم

محمد عبدالرحمن زەنگنە

٣

پێشـــکەشە بە ( ع )

کە کۆڵی نەدا لە پێناوی ئەوینـــا .

نووســـەر

## چەند ووشەیەك

دەرهێنەری زیرەك ئەتوانێ ئەم تەمسیلیە شانۆگەریــە بــە چەند جۆر دەرهێنی بۆ شانۆ ، ئیستگە ، تەلەفزیۆن ، سینەما .

تەنها بۆ شانۆ لە رێــگەی تاریكو روونـاكیـیــەوە ئەبــێ .
هیواو ئاواتم ئەوەیە هەموو باوكێ وەكو كوێخــا حەمــە ســوورو كوێخا قــادر بــن .

محمد عبدالرحمن زەنگنە

بەغــدا

## پەردەی یەکـەم

( دیمەنی ماڵی کوێخا محەمەد ، کوێخا حەمە سوور لـــە تیرەی کەماڵی جـاف )

حەمە سوور ـ خوایە هەر خۆت گەورەی لە تۆ زیاتر کەس گەورە تر نییە ... خوایە ... خۆت ئاگاداری کە من چەندە دەوڵەمەندم هەرچیم هەیە لە رێگەی تۆدا ئەیبەخشمەوە تەنها کورێکم پێ ببەخشە ( لەم کاتەدا لە دەرگـا ئـەدرێ ) .

هــــەژار ـ لە رێی خوداو پێغەمبەر شتێکــم بدەنێ هەژارم دەس کۆرتم خوا رەحمتان پــێ بکا ، دڵتان خۆش کا .

حەمە سوور ــ بڕۆن (١٠) لیرەی زێڕی بدەنێ •

خزمەکار ــ (دە لیرەی بۆ ئەبا) فەرمــوو ئەمــە (١٠) لیــرەیە ، کوێخــام بۆی ناردوی •

هــــەژار ــ یاڕەبی خودایە ڕەحم بــەم پیاوە بکەی ، ئیمانــی بە هێز بکەی •

خزمەکار ــ ئاغام کوڕی نییە دوعای خێری بۆ بکە •

هــــەژار ــ ( بە دەنگی بەرز ) یاڕەبی خودایە بۆ خاتری گەورەیی خۆت کوڕێکی جوانی پــێ ببەخشی •

حەمە سوور ــ ( گوێی لە دوعای هەژارەکە ئەبــێو ئەلــێ ) بــە گەورەیی خودا ئەگەر کوڕێکم بداتێ هەرگیز ڕاناوەستم لە خێرو حەسەنات ، تۆیش سالێکی کە وەرەوە شەرت بــێ شەرتی پیاوەتی خودا ئەگــەر کوڕێکــم پــێ ببەخشێ (١٠) لیرەیکەت ئەدەمێ •

هــەژار ــ خودا تەمەنت درێژ کا ••• ئینشەللا خودا کوڕێکــت پێ ئەبەخشێ ••• خوا حافیز •

خزمەکار ــ خوات لە گەڵ ئیتر سوال مەکە •

هــەژار ــ (١٠) لیرەم هەیە ئەڕۆم کاسبی ئەکەم •

حەمە سوور ـ خەڵکینە بەو خودایە کە هەمووماڵی خوڵقاندووە ئەگەر کورێکم بو ... لە دونیادا هەردەم ئەبێ یارمەتـــی هەژارو لــێ قەوماوان بدەم ... مزگەوت دروســـت بکەم ... یارمەتی پیاوە ئاینییەکان بدەم .

( مۆســیقا )

## پەردەی دووەم

خزمەکار ــ (بە پەلە) گە ... گە ... گە ... گە گە ... گەورەم.

حەمە سوور ــ ئەوە چیتە لاڵ بویت بۆ قسە ناکەی .

خزمەکار ــ ئاغام گەورەم .. مزگێنی .. مزگێنی .. مزگێنی خودا
کورێکی پــێ بەخشیوی .

حەمە سوور ــ خودایە سەد شکور .. سەد جار شکورم بە بەشت
خێرا مەڕو بەرخ سەربڕن نانی ئاوایی هەمووی بدەن
نانی هەژار بدەن ... دەهۆڵو زوڕنا لێدەن بیکەن بە

شایی با کوڕو کچی جاف هەڵپەڕن .. دەی دەهۆڵــو زوڕنا لێدەن ( دەهۆڵو زوڕنا لــێ ئەدرێ وردە وردە کوڕو کچ بەرەو ماڵی حەمە سوور دێن هەڵپەڕکێ دەس پێ ئەکـا ) .

## پەردەی سێهەم

حەمە سوور ــ ماشەڵلا •• ماشەڵلا خودایە لێت بە زیاد بێ ئەوا کوڕ
بوو بە دوو ••• یەکەمیان وەلیو دووەمیان رەسوڵ •

مێوانێـك ــ خودا ئەم دوو کوڕەت لێ نەسەنێ تەمەنیان درێژکا بە
دایكو باوك گەورە بن ••• کۆێخا بۆ مەلایەکیان بـۆ
ناهێنی با فێری خوێندن ببـن •

حەمە سوور ــ ئەمەوێ بڕۆم بۆ سلێمانی ••• مەلایەکیان بۆ بێنـم
ئەم دوو کوڕەم فێری خوێندن بـن •

میـــوان ـ زۆر چاکە ئەلحەمیلا جەنابت دەولەمەندی تاکـو زووە مەلایەك بێنە ، ئەبێتە مەلای دێیەکەو بە منداڵەکانیش دەرس ئەڵێتەوە .

حەمە سوور ـ زۆر چاکە لە ئێستاکە زووترنیە ئـەڕۆم .. لالـۆ مەحمود .

لالۆ مەحمود ـ بەلێ گەورەم ئەمرکە .

حەمە سوور ـ خێراکە ماینەکەم بۆ زین کە تاکو بڕۆم بۆ سلێمانی.

لالۆ مەحمود ـ بەلێ گەورەم .. هەر ئێستاکە ئامادەی ئەکەم .

حەمە سوور ـ ئێی خەلکینە بەو خودایەی بێ شـەریكو بـێ مەکانە ... هەتا ماوم خزمەتی هەژارو لێقەو مـاوو پیاو ماقووڵ ئەکەم .

میـــوان ـ گەورەم زۆر چاك ئەکەی .

لالۆ مەحمود ـ گەورەم ماینەکەم ئامادە کردووە .

حەمە سوور ـ ( لەگەڵ پیاوێکا هەڵئەسن و ئەچنـە دەرەوە ) یاڵـلا کاکەمین بابڕۆین بۆ سلێمانی بەلکو مەلایەك بێنین .

(مۆسیقـا )

## پەردەی چوارەم

( تەکیەو قوتابخانەی شێخ مارفی نۆدێ لە سلێمانی )

فەقێ ــ قوربان دوو ماین سووار ڕویان کردە ئێرە •

شێخ مارف ــ بە خێر بێــن •

فەقێ ــ گەورەم وا بزانم کوێخا حەمە سووری جافە •• با بــڕۆم
ماینەکانیان لێ وەرگرم و بیبەستمەوە •

شێخ مارف ــ زۆر چاکە خێرا بڕۆ •

کوێخا حەمە ــ (دێتە ژوورەوە لەگەڵ هاوڕێیەکەی بە جووتە) سەلاموون
عەلەیکــم •

شێخ مارف ــ عەلەیکمو سەلام وەرحمة الله وەبرکاتــە ، یا خــوا
به خێر بێــن •

حەمەسوورو هاورێیەکەی ــ ( دەستی شێخ ماچ ئەکەن ئەویــش
ئەملاو ئەولایان ماچ ئەکا ) زۆر سوپاست ئەکەیــن ،
چۆنی قوربان چاکی ؟

شێخ مارف ــ فەرمو دانیشــن •

حەمەسوورو هاورێیەکەی ــ ( دائەنیشن ) ئەی قوربان تەندروستیت
چۆنــە ؟

شێخ مارف ــ سوپاس بۆ یەزدان زۆر باشم •• به خێــر بێن بــه
سەر چاو •

حەمەسوورو هاورێیەکەی ــ دەستت ماچ ئەکەین ••• هەر بۆمــان
بمێنــی •

شێخ مارف ــ له سەر خودا ••• شکور باشم ، ئا کوڕم فەقــێ
قاوەیەك ••• چایەك بێنه بۆ کوێخا •

حەمه سوور ــ قوربان خودا تۆکەرێکی تۆی پێ بەخشیومو ئەمەوێ
بیخەمە بەر خوێندن ، تکام وایه ڕێ بدەی به مەلایەك
بیبەمــە ناو هۆزەکەم •

شێخ مارف ــ زۆر پیرۆزه •• فەقێ •• کوڕم فەقێ •

فەقێ ــ بەڵێ قوربان ئەمرکــە •

شێخ مارف ــ ئا بڕۆ مەلا یوسف ــ م بۆ بانکه •

فەقێ ــ ئەمرەکەی گەورەم ( دەر ئەچێتە دەرەوە ) •

شێخ مارف ــ کوێخا ئەمساڵ دەغڵو داتتان چۆنە •
کوێخا حەمە ــ لە خودا بە زیاد بێ تاکو بلێی باشە •
شێخ مارف ــ لە خودا بە زیاد بێ یاخوا هەموو ساڵێك ئاوها هات بێ •
مەلا یوسف ــ ( دێتە ژوورەوە ) سەلامون عەلەیکم •
هەمووان ــ عەلەیکمو سەلام •
مەلا یوسف ــ کوێخا بە خێر بێن ، بە سەر چاووم •
کوێخا حەمە ــ خودا سەلامەتت کا •• خۆت بە خێر بێیت مەلا یوسف •
شێخ مارف ــ مەلا یوسف بە خێر بێیت •
مەلا یوسف ــ دەستت ماچ ئەکەم قوربان •
شێخ مارف ــ مەلا یوسف •
مەلا یوسف ــ بەڵێ قوربان •
شێخ مارف ــ ئەوا کوێخا حەمە سوور هاتووە مەلایەکی پێویستە بۆ هۆزەکەیو خودا کوڕێکی پێ بەخشیوە •• منیش تۆم بە باش زانی کە لە گەڵیان بڕۆی •
مەلا یوسف ــ قوربان ئارەزووی جەنابتە •
شێخ مارف ــ بەڵکو بە زوویی خۆت ئامادە بکەیو لەگەڵ کوێخادا بڕۆی •
مەلا یوسف ــ بەڵێ ئەمرەکەی گەورەم •

( هەموو هەڵسان بۆ ئەوەی بەڕێ بکەون )

( مۆسیقا )

## پەردەی پێنجەم

( دیوە خانی کوێخا حەمە سووڕ ... کەسانێکی زۆر دانشتوون چا ئەخورێتەوە ) .

یەکێك ــ ئەرێ وەڵڵا کوێخا حەمە سوورە لەگەڵ هاوڕێیەکـــەی و پیاوێکی نامۆیان لە گەڵدایە ... نا ... نا ... نامـــۆ نی یە ، سەری سپی یە ؛ دیـــارە کوێخا مەلای هێنـــاوە .

هەمووان ــ ڕاستە کوێخا حەمە سوورە لەگەڵ هاوڕێیەکەی و مەلایەك .

کوێخا حەمە ــ ( دێتە ژوورەوە لەگەڵ مەلا یوسف ) سەلامـــون عەلەیکـــم .

هەمووان ــ ( هەڵئەسن ) وەی عەلەیکم و سەلام .. وە رحمـــةالله وبرکاتە ، بە خێر هاتنەوە بە سەر چاو .

کوێخا حەمە ــ ( ڕوو ئەکاتە دانشتووانو ئەڵێ ) مەعلومی ئێوەیە کە
من ڕۆیشتم مەلا بهێنم ... ئەوە مامۆستا مەلا یوسف ــە
کە جەنابی شێخ مارف ــ ی نۆدێی خۆی ئەم زاتــەی
هەڵبژاردووە ... ئیتر ئەبێتە مەلای دێیەکەمانو دەرسیش
بە منــاڵەکانمــان ئەڵێتەوە ، پێویستە لە سەرمان ڕێــزی
مامۆستا بگریــن •

هەموان ــ ( هەڵئەسنو دەستی ماچ ئەکەنو ئەڵێن ) مامۆســتا بــە
خێر هاتی گەورە مانت کرد •

مەلا یوسف ــ سوپاس بۆ هەموو لایەك ... هەروا سوپاس بۆکوێخا
حەمە سوور .

هەموان ــ زۆر سوپاسی کوێخا حەمە ئەکەین چونکە یەکێکی وەکو
جەنابتی بۆمان هێناوە •

کوێخا حەمە ــ خێرا خانووە تــازەکەو مزگەوتەکــە پــاك کەنــەوە
حەسیرو فەرشی تێخەنو فانــۆسی بــۆ بەرن ... ئیتر
مامۆستا لە مزگەوت ئەبێ تاکو ماڵەکەی بۆ ڕێك ئەخەین •

مامۆستا ــ زۆر سوپاس کوێخا •

کوێخا حەمە ــ بڕۆن (٢٠) سەر مەڕو (٢٠) سەر بزنو (٢) مانگــاو
(٢) وولاٌخی بۆ جیا بکــەنەوە ، زەوییەکەی ئــەو پــاڵە
هەمووی بۆ مامۆستا •

مامۆستا ــ زۆر سوپاس کوێخا .. ئیتر بەسە لە خودا بە زیاد بێ و
لە جەنابت ئەمانە زۆر زۆرن •

کوێخا حەمە ــ مامۆستا ئەمانە هەمووی هی خۆتە من لەگەڵ خودای
خۆما شەرتم کردووە بەم جۆرە بم ... نــەك لەگــەڵ

یەکێکـــی وەکو جەنابتـــا بەڵکـــو لەگـــەڵ هەمـــوو لێ قەوماوانو هەژارانا چونکە ئەگەر ئەم هەژارانە نەبـــن ئێمەیش قەدرو قیمەتمان نابێ ، قـــەدری ئێمـــە بـــەم هەژارانەوەیە ، تاکو ماوم خزمەتیان ئەکەم .

مامۆستا ــ خودا وێنەت زۆرکا .

کوێخا ــ بە خودای گەورەو بێ هاوتاو بێ جێگا ، هەر وا ئەبم تاکو سامانم هەبێ لە ڕێی ئەم هەژارانەدا ئەیبەخشـــــمەوە قالە .. قالـــە .

قالە ــ بەڵێ گەورەم .

کوێخا حەمە ــ بڕۆ ماڵـــەوە بڵێ بە کوێخا ژنت چاکترینو پاکتریـــن نوێنو ماڵ جیا بکاتەوە بۆ مامۆستا کە شایستەی بێ .
( ئەوانەی کە کوێخا ئەمری پێیان کرد هەموو ڕۆیشتـــن هەر یەکە بۆ فەرمانو کاری خۆی ) .

یەکێك ــ کوێخا کە وابو مامۆستا ئێستاکە تەنها ژنێکی ماوە بەڵکو ژنە کەیشی بۆ بهێنی .

کوێخا حەمە ــ لالۆ کە وابو من داوای کچەکەت ئەکەم پێشکەشی کەی بە مامۆستا مەلا یوسف .

لالۆ ــ ئەوا پێشکەش بێ بە ئێوە قوربان کچێك جەنابت بیدەی بە مێرد من خاوەنی نیـــم .

کوێخا حەمە ــ زۆر سوپاست ئەکەم لالۆ .

مامۆستا ــ ( هەڵئەسێو دەستی لالۆ ماچ ئەکاو ئەڵێ ) زۆر سوپاس ... منیش کچەکەتم قبوڵ کرد ، ئەوژنەی کوێخا بۆ منی

بهێنێ زۆر چاکە •• سوپاس بۆ هەموو لایەك •

کوێخا حەمە ـ مامۆستا •• با جێگەو ڕێگەی خۆت بزانی پاش پێنج شەش مانگی کە بە خێر ژنەکەت بگوێزەوە •

مامۆستا ـ چۆن ئەفەرموی ئاوها ئەبێ •

( مۆسیقـا )

## پەردەی شەشەم

( پاش شەش مانگ جلو بەرگ هەڵئەگرنو ... شایی دەس پێ ئەکا ... دەهۆڵو زورنا لێ ئەدرێ .. ڕەش بەڵـەك دەسـی گرتـووە . )

کوێخا حەمە ــ وا بزانم کوێخا قادر شیروانیش هات ... ئەرێ وەڵڵا

کوێخا قادرە ( هەموو چاوە ڕوانن تاکو دێتـە نــاو شاییەکەوە )

کوێخا قادر ــ سەلاموون عەلەیکم .

هەموان ــ عەلەیکمو سەلام .. یاخوا بە خێر بێن بە سەر چاو .

کوێخا قادر ــ خودا خۆشتان کا .. هەموو لایەك باشن ؟

کوێخا حەمە ــ سوپاس بۆ یەزدان زۆر باشین .. وا تێ ئەگەم
هەواڵەکەت پێ گەیشت کە مەلامان هێناوەو ژنمان بۆ
خواستووە ئەوەتا ئەم شاییە بۆ مامۆستایە .
کوێخا قادر ــ بەڵێ بەڵێ هەواڵەکەم پێ گەیشتو خزمەکارەکەت
خەبەری بۆ هێنام ، منیش زۆرم پێ خۆش بو .
کوێخا حەمە ــ فەرمو کوێخا قادر ... فەرمو دانیشە ... فەرمو
فەرمو .
کوێخا قادر ــ زۆر سوپاس فەرمو دانیشن ( هەموو دا ئەنیشن )
کاکی چاوەش لێدەن لە دەهۆلو زورنا ، شایەکە بە تاڵ
مەکەن شەوی وا خۆشمان کوا هەیە ، ئەوا لە خودا
بە زیاد بێ کوێخا حەمە دوو کوڕی هەیەو مەلای هێناوەو
شایی بۆ ئەکا . ( دەهۆلو زورنا لێ ئەدرێ کوڕگەلو
کچان دەس ئەگرن هەلئەپەڕنو شایی گەرم ئەبێ ، جارو
باریش تەقە ئەکرێ ) .
یەکێك ــ ئا وەرە زورنا ژەن ( شایی ڕائەوەستێو هەندێ پارەی
ئەداتێو ئەڵێ ) شاباشی هەردوو کوێخا بکە .
چاوش ــ شاباش ... شاباش ... شاباش کوێخا قادرو کوێخا حەمە
سوور لە کیسەی سمایل مالی ئاوا سمایل ... مالی ئاوا
سمایل ( ئیتر لە هەموو لایەکەوە شاباش دەس پێ ئەکا ..
ڕەش بەلەك بەردەوامەو هەندێکی پێ ئەچێ )
یەکێکی کە ــ کاکی دەهۆڵ لێدەر بیکە بە سێ پێیی بەلکو ژنو

کچەکان پشوو بدەن ( سێ پێ‌یی دەس پێ ئەکاو کچان‌و ژنان دەس بەر ئەدەن ماوەیەکی چـــاك کورِگـــــەل هەڵئەپەڕن ) •

کوێخا قادر ــ ئیتر بەسە بیکەن بە شەو چونکە کات درەنگــەو بەشی سبەی بهێڵن هەموو دەس بەر ئەدەن وردە وردە خەڵکە کە چۆڵی ئەکەن ، هەریەکە بەرەو ماڵەوە ئەڕۆن کوێخا قادرو کوێخا حەمە پێکەوە ئەمێننەوە ) •

کوێخا حەمە ــ ئێی کوێخا قادر یاخودا بە خێربێیت بە ڕاستی زۆرم ئارەزو ئەکردی چاووم ڕوون بووەوە •

کوێخا قادر ــ لە ڕاستیدا خۆم ئەمەویست بێم چونکە ئیشم هەبوو پێــت •

کوێخا حەمە ــ ئیشی تۆ بە سەر سەرم •

کوێخا قادر ــ ئەوەی ڕاستی بێ ئەمەوێ شەمسە بهێنمە لاتان بــۆ ئەوەی لای مەلا یوسف بخوێنێ ، چونکە ئەو مەلایەی خۆمان مەلایەکی ئەو تۆ نی‌یە ••• بۆیە حەز ئەکەم مەلا یوسف دەرسی پێ بلێ •

کوێخا حەمە ــ وەی بە سەر چاو ••• جا کوێخا قادر کــێ لــە عاستی جەنابتا خاوەن ماڵ‌و کوڕو مەلایە ••• چۆن ئارە-زوو ئەفەرمووی ئاوها ئەبێ ••• هەرکە گەڕایتـــەوە شەمسە بنێرە ئەیخەینە ناو چاومانەوە ••• کچی تـــۆ کچی منــە •

کوێخا قادر ـ زۆر سوپاست ئەکەم کوێخا ... من خۆم ئەمزانی
خاتری من ئەگری ... ئەبێ زۆر باش چاووت لێ بێ .

کوێخا حەمە ـ کوێخا قادر ... ئەمە قسەی ئەوێ .. وەکو وتم
شەمسە کچی خۆمەو ئەیخەمە ناو گلێنەی چاومەوە .

کوێخا قادر ـ زۆر سوپاس کوێخا حەمە ... بە راستی برایەکی
باشی دەبا ئێمەیش هەڵسین بڕۆینەوە .

( مۆسیقا )

## پەردەی حەوتــەم

( شوێن حوجرەی مەلا یوسف ــ ە چەند قوتابیــەك دەرس ئەخوێنن ••• وەلی‌و شەمسە پێکەوە دانشتوون نزیك مەلا یوسف

مەلا یوسف ــ یاڵلا کوڕەکانم دەرسەکانتان بخوێنن •

قوتابیەکان ــ ئەلف سەر ئا ••• لام زەنە ئەل ••• جیّ سەر حە ••• میم زەنە حەم ••• ئەل حەم ••• دال بۆر دوو ••• ئەل حەم دوو •

مەلا یوسف ــ ئافەرین ••• لە سەر خۆتان مەیکەنە رۆژی خۆتان •

قوتابیەك ــ مامۆستا ئەچم بۆ ئاو دەس •

مەلا یوسف ــ بڕۆ کوڕم •

قوتابییەکیکە ــ مامۆستا منیش ئەچم بۆ ئاو دەس .
مەلا یوسف ــ برۆ کوڕم .
قوتابییەکی تر ــ مامۆستا منیش .
مەلا یوسف ــ دانیشە نارۆی .
هەمووان ــ ئەلف سەرِ ئا ... لام زەنە ئەل ... جێ سەر حە ..
میم زەنە حەم ... ئەل حەم ... دال بۆر دوو ..
ئەل حەم دوو .
مەلا یوسف ــ وەلی کوڕم ؟
وەلی ــ بەڵێ مامۆستا .
مەلا یوسف ــ کوڕم دەرسەکەت ڕەوانە ؟
وەلی ــ مامۆستا ئەم ووشەیەچییە ؟
مەلا یوسف ــ قل اعوذ برب الفلق من شر ما خلق .
وەلــی ــ قل اعوذ برب الفلق من شر ما خلق .
مەلا یوسف ــ ئافەرین وەلی ... شەمسە ... تۆ دەرسەکانــت ڕەوانە ؟
شەمسە ــ بەڵێ مامۆستا زۆر باش ئەیزانم .
مەلا یوسف ــ ئادەی سورەتێکم بۆ بخوێنەوە .
شەمسە ــ الم تر کیف فعل ربك باصحاب الفیل ( تا دووایــــی ئایەتەکە ) .
مەلا یوسف ــ ئافەرین شەمسە زۆر چاکــە ... ئەوانــە کێــن ؟
کوێخا قادرو کوێخا حەمە سوورە هاتوون .
هەردوو کوێخا ــ سەلام‌و عەلەیکم .

مەلا یوسف ــ عەلەیکمو سەلام وە رحمة الله وبرکاتە ••• بە خێر بێن بە سەر چاوان ••• فەرموو دانیشن ( دائەنیشن لە تەنشت مامۆستاوە ) •

کوێخا قادر ــ مامۆستا ماوەیەکە شەمی کچم نەبینیوە یادی ئەکەم •

مەلا یوسف ــ بە خێر بێن بە سەر چاوم گەورەتان کردین •

کوێخا قادر ــ کچم شەمسە لە خوێندنا چۆنی ؟

شەمسە ــ بابە گیان زۆر باشم ••• مامۆستا زۆر باش دەرسمان پێ ئەلێ •

کوێخا قادر ــ زۆر چاکە کچم ••• باشە ئەی الەوە چۆنی ؟ خۆ یادی دایکت ناکەی ؟

شەمسە ــ نە وەللا ••• پاش ئەوەی لە لای مامۆستا دێینەوە ••• پاشان ئەچینە ماڵەوە نانی نیوە ڕۆ ئەخوێن ، پاشان ( تەماشای وەلی ئەکا ) لە گەڵ وەلی دا بۆ خۆمان لە دێیەوە ئەچینە دەرەوە لە سەر گردەکان یاری ئەکەین •

کوێخا حەمە ــ کوێخا قادر ••• بەو خودایە شەمو وەلی ئەوەندە ڕێکن زۆر یەکتریان خۆش ئەوێ ••• موو بە بەینیانەوە ناچێ بە گەورەیی خودا بە قەد وەلی شەمسەمان خۆش ئەوێ •

کوێخا قادر ــ وەللاهی ئەزانم جا ئەگەر وا نەبێ من چۆن شەم بەرەڵلا ئەکەم •

مەلا یوسف ــ ئەوەی ڕاستی بێ زۆریش زیرەکن خێرا دەرسەکانیان لە بەر ئەکەن •

کوێخا قادر ــ مامۆستا جەنابتان رازین لێیان ؟
مەلا یوسف ــ بەلێ زۆر رازیم لێیان ، من چیم ئەوێ ؟ ئەمەوێ دەرسەکانیان لە بەر کەنو هەروا ڕەوشتیان باش بێت هەردووکیان بە گوێرەی دلی منە .
کوێخا قادر ــ زۆر سوپاس مامۆستا ... ئێمەیش ئەمانەوێ منالەکانمان وابن جا مامۆستا ئێمە بە خودات ئەسپێرین .
مەلا یوسف ــ خوداتان لە گەڵ بە خێر بێن بە سەر چاوم گەورەتان کردین ( هەردوو کوێخا هەلئەسنو دەستی مامۆستا ئەگوشن ) خوا حافیزتان .
کوێخا حەمە ــ مامۆستا ئەوا مەعلومی جەنابتانە کوێخا قادر مێوانمانە ، بۆ نیوە ڕۆ تەشریف بفەرمو بۆ ماڵ ئێمە .
مەلا یوسف ــ زۆر سوپاس جەنابی کوێخا ... بە سەر چاو .
هەردوو کوێخا ــ خوا حافیز بە دوعا .
مەلا یوسف ــ خواتان لەگەڵ ... لە ئامانەتی خودا دا بن ... یاڵڵا کوڕەکانم هەریەکە دەرسەکانی بخوێنێ باش ڕەوانی کەن ( هەموو قوتابییەکان دەس ئەکەن بە خوێندن پاش ماوەیەك ) دەی کوڕم هەریەکە بۆ ماڵی خۆتان لە ڕێگا نارەحەتی مەکەن بە ڕێكو پێکی بڕۆن ..
وەلی ــ مامۆستا ئێمەش بڕۆینەوە ؟
مەلا یوسف ــ کوڕم منیش بۆ نیوە ڕۆ لە ماڵ ئێوەم پێکەوە ئەڕۆینەوە هەندێك چاوە ڕێم بکەن تاکو خۆم ئەگۆڕم .

وەلی ــ بەڵێ باشە مامۆستا ( ماوەیەك چاوەڕێ ئەكەن ) شەم
ئەمڕۆ ئەڕۆیتەوە لە گەڵ باوكتا •
شــەم ــ ئەمەوێ بڕۆمەوە چونكی بیری دایكم ئەكەم •
وەلی ــ زۆرت پێ ئەچێ ؟ ••• ئەگەر دووا بكەوی بیرت ئەكەم •
شــەم ــ نــا ••• زوو دێمەوە چونكە منیش بیرت ئەكەم •
مەلا یوسف ــ ئەوە چیتانە ؟
وەلی ــ مامۆستا شەم ئەڵێ ئەڕۆمەوە بیری دایكم ئەكەم •
مەلا یوسف ــ با بڕواتەوە لە پاشان خۆی دێتەوە •
وەلی ــ مامۆستا ئەترسم زۆری پێ بچێ دوو بیری ئەكەم •
مەلا یوسف ــ زوو دێتەوە مەترسە ••• یاڵلا . بڕۆین بۆماڵتان •
( ئەكەونە ڕێ بۆ مــاڵ كوێخا حەمە سوور ) •

( . مۆســیقا )

## پەردەی هەشتەم

( ماوەیەکی زۆر بە سەر چوو وەلیو شەم گەورە بوون ، شەم قورئانی پیرۆزی تەواو کردو چەند کتێبێکی خوێند ، شەم بە ئێجگاری ڕۆیشتەوە بۆ مالی باوکی لە هەمان حوجرەی مامۆستا مەلا یوسفو قوتابییەکان دانشتوونو وانەکانیان ئەخوێنن )

مەلا یوسف ـ وەلی ماشەڵڵا گەورە بویتە ئەبێ بە زوویی دەرسەکانت فێر بی •

وەلی ـ ئەمرەکەی مامۆستا •

مەلا یوسف ـ کوڕم کتێبەکەت دەرکە دەرسەکانت بخوێنە •

وەلی ـ کام کتێبیان ؟

مەلا یوسف ــ گولستانی سەعدی •
وەلی ــ بەلــێ باشــە •
مەلا یوسف ــ کوڕم ئەمڕۆ دەرسەکەت دەربارەی مەجنونو لەیلایە •
وەلی ــ مامۆستا مەجنونو لەیلا یانی چی ؟!

مەلا یوسف ــ مەجنونو لەیلا ••• مەجنونو لەیلا ••• مەجنون ناز
ناوی قەیسە ••• دلی ئەچێ لە لەیلای ئامۆزای ماوەیەك
زۆر پێکەوە ئەبن لە پاشان باوکی قەیسو باوکی لەیــلا
واتە هەردوو برا لە یەك زیــز ئەبنو لە یەك دائەبڕێن ،
ئەم قەیسە شێت ــ ی لەیلا ئەبێ لە هەردەو چۆڵو بــێ
ئاباناا ئەسورێتەوە بۆیەپێی‌ئەلێن مەجنون ــ واتە شێت •
وەلــی ــ (موچرکەیەك به لەشی دا هاتو لەرزەیەکی کرد ) پەنا
بەخــوا •

مەلا یوسف ــ وەلی ئەوا بۆ موچرکە هات بە لەشتاو لەرزیت •
وەلــی ــ پەنا بــە خودا لە شەڕی ئەوێن •
مەلا یوسف ــ کوڕم وەلی دەرسەکەت تەواو بو ••• فەرمو بڕۆ
بۆ مالەوە •

( مۆســیقا )

## پەردەی نۆیــەم

( چێشتە نگاوێ ... رۆژێ لە رۆژەکانی زستان )

وەلی ـ قالە ... حەمە قالە .. ئەسپەکەم بۆ زین بکە ئەچم بــۆ ئاسکەڕاو .

خزمەکار ـ بەلێ گەورەم . ( لە پاش ماوەیەك ئەسپەکە زین ئەکاتو لەغاو ئەخاتە دەم ئەسپەکەو ئەیهێنێتە بەردەم وەلــــی ) فەرموو کاکە وەلی ئەسپەکەم ئامادە کردووە .

وەلی ـ زۆر سوپاس ( وەلی دەر ئەچێ ... مۆسیقاو دەنگی پێی ئەسپ ) .

دەنــگ ـ لە پاش گەڕانەوەی لەڕاو دەمە ئێوە ڕۆ لە قەراخ چەمی
گوپان ، کۆمەڵی کچو ژنی دێ ... شەمسەش لەگەڵیاندا
بو ، کەچاوی کەوت بە شەم گەورە بووە ، چەند شۆخو
شەنگو نازدارە لە جوانیدا بێهاوتایە یەکسـەر توشـی
داوی ئەوینی شەم بو ، لەولایشەوە شەم یەکسەر توشی
داوی ئەوینی وەلی بو ، کە بینی چۆن سووار چاکـەو
چەند لاوێکی جوانە .. هەردووك بە تیری ئەویـــن
بریندار بــوون . ئەسپەکەی لەلایەکەوە بەستەوە .

وەلی ـ ( وەك شێت بە هەردەو چۆڵو بێ ئابانەوە ئەسووڕایەوە )
ئای خودایە چیم بە سەر هات ، هاوار بۆ خۆم دەرد.م
چی‌یە ؟! بۆچی وام لێهات !! چێم لێ قەوماوە ؟!

دەنــگ ـ بەتیری عەشقی شەمسە تاپەڕنیشتۆتە پەرەی جەرگت !
رزگار بونت،یا گەیشتن بە شەمسە یا مردنە ؟

وەلــی ـ لەڕێی‌خودا هیچ چارەم نی‌یە ؟!

دەنــگ ـ چارەت شەمسەیە ... هیچ چارەیەکت نی‌یە .

وەلــی ـ ئای شەمسە بۆ وات لێ کردم .. گوناهم چی بو پەنــا
بە خودا لە شەری ئەوێن (سەر ئەکەوێتە سەر بەرزایی‌یەك)
ئەم شیعرە ئەخوێنێتەوە ) .

مەحـبـووب جافان ، . . . . . . . .

مەحبووب بێ عەیب تایفەی جافان
سەر قەتار رەم عەنبەر بۆ نافــان

سەرکێـش رەوێـڵ موشکیـن کلاٚفان
ئاهووی مودبر مـاس ، مەکان نەهەردە
چووزەی سونبول چەر ، نەسا سڵ کەردە
خاوێـرو خاڵدار ( خەتاو خوتەن ) ماڵ
تەتار ( تایف ) ، شۆخ شیرین خاڵ
وەتـەن نەزامەن سەربەرز لەیـلاخ
سەیر سەرکـوان ، سەیادان وە داخ
چەرخو چەم سیا ، جوستو چالاك پەڕ
شەیدای شکار دۆز چنـگ وە هووناو تەڕ
لاچیـن شەش دانگ سەمەر جەلات خێـز
شەمقـار تیـژ بـاڵ تەیر توند گورێز
شەمع شا پەسەند گشت سیا یانـان
نـام توون نە بەزم خوسرەوان ، خانـان
بە شەوق چەمین ( شەم ) روخسـارەوە
کێـت نەدا وە دەم گڕەی نارەوە
بنـەو قاش قەتـران دڵ پێ ئێشاوە
ستوون یانەی کێـت نەکێشـاوە
بەو دیدەی سیای سورمە سای سێوەنگ
موژانت وە هوون کـێ نەکەردەن ڕەنگ
بەونیم نیگای نـاز ، بەو لەنجەو لارە
ئاخـر جەرگ کێـت نەکەردەن پارە
بەو نیـم نیگای نـاز پێوار نە پەردە

ئاخــر کێت نەکەرد وە ئازیــز مەردە
بــەو باڵای نەو تووڵ وە نەو ڕەستەوە
بەو کۆکۆی کلاَف دەستە دســتەوە
واچە دلی کیت نەســتانان وە زوور
ئاخــر یانەی کێت نەکەردەن خاپــوور !!
مــن دیوانە نیــم بیم جە داخ تــۆوە
داخ نیای وەبان دەماخ جە نــۆوە

(مۆســـیقا)

## پەردەی دەیـــەم

. ( لە ناو ئاوایی دەنگو باسی وەلیو شەم بلاو ئەبێتەوە کـــە دڵیان بە یەکەوەیە ، شووانەکان شەوان دائەنیشن ئەم قسانـــــە ئەکـــەن ) •

شوانی ١ ـــ براکانم ئەمڕۆ وەلی وەك شێت سەر ئەم گردو ئـــەو گرد ئەکەوت لە بەر خۆیەوە شیعری ئەوت •

شوانی ٢ ـــ منیش گوێم لە شیعری بووە •

شوانی ١ ـــ ئەی گوێت لە مەحبووب جافان نەبووە ؟؟

شوانی ٢ ـــ نە بە خودا گوێم لەو شیعرە نەبووە ؟

شوانی ١ ـــ ئای کە چەند خۆشە ئەو شیعرە ، ئەوەندەم گوێ لێ بووە زۆریم لە بەر کردووە •

شوانی ٢ ــ تو خودا زوو که چەن دێرێکی بخوێنەوە •

شوانی ١ ــ با تۆزێك بیری لێ کەمەوە •

شوانی ٣ ــ توو خودا زووکە ئەڵێن ئەو شیعرەی بە سەر (شەم) دا هەڵداوە •

شوانی ١ ــ بەڵێ بەڵێ بە سەر (شەم) هەڵی داوە ، ئەم شیعرە کە مەحبووب جافان ــ ە ئێستاکە شەش حەوت دێری ئەخوێنمەوە بۆتان • ( شیعرەکە ئەخوێنێتەوە ) •

شوانی ٢ ــ ئای کە ئەم شیعرە چەند خۆشە بە خودا منیش شاعیر بوومایە شیعرێکی وام ئەوت بە سەر فاتەدا ••• ئای فاتە ( داخ هەڵئەکێشێ ) کەی باوکت رازی ئەبێ ؟ ئەم باوکەت بۆ ئەوەندە دڵ ڕەقە ••• ئەڵێ بە خزم نەبێ نایدەم •

شوانی ١ ــ جا بڕۆ لای وەلی تیماری دڵت ئەکا ••• ئەی باشە ئێوە ئەزانن ناوی بە دێوانە دەرکردووە •

شوانی ٢ ــ من تاکو ئێستاکە شتی وام نەبیستووە ؟!

شوانی ١ ــ بەڵی ئەوەتا لەم شیعرەیا ئەڵێ •

هامسەران نامم ، • • • • • • •
من نامم گنۆ ( دێوانە )ن نامم
چەوساوە رسوای دەور ئەیامم
روێ نەگێلا گەردوون بە کامم
جەو رۆ جە ( بطن ) مادەر پەیدا بیم
مەجنوون کۆ گەرد شێتو شەیدا بیم

هەر خاتر خەمیـــن دەروون پەڕداخ بیـــم
هەر دلگیر دەرد وێـــلو دۆساخ بیـــم
هەرچەم پەڕ ئەسریـــن مـــاتو مەحزوون بیم
هەر گیرۆدەی جەور جەفای گەردوون بیـــم
هەر دایـــم رەقیـــب رەهندەی را چەڤت
وەردا وە جەستەم ئایـــر چەنی نەفت
ئەر سەد سزا کێش بار مەینەت بێـــم
بەلـــێ سازا بیـــم چەنی بەخت وێـــم ،
ئێستا رویێ جە راگوزەر دا
( شـــەم ) شێوە جە نـــۆ ئایر جێم وەردا
ئەو دی بلێســـەم جە گەردوون وە یەرد
بیـــم وە کۆی زوخال سفتەم بیی وەگەرد
پەروانە دەستوور پـــەڕ سفتەی زوخال
ســـۆزان بیم وەشەوق شۆلەی شەم جەمـــال

ئاهـــر جەستەم هەر نەبی خـــامۆش
تا قـــرچەی جەرگم شنەفتـــم بە گـــۆش ،
ئـــەوەل چۆن مەجنوون وێل سارا بیـــم
دێوانـــەی دلگیـــر جە خەم دارا بیـــم
ئیســـە دێوانەی پـــەڕ بـــال سفتـــەم
وێـــل بەرداو بەرد ، کـــۆس وە کۆس کەفتەم
هامسەران سفتـــەی شـــۆخ ( شەم ) لقـــام
چـــون مەبـــۆ عیـــلاج ، وە چێشەن دەوام

دێــوانە ، هەرکەس دڵ داوە خەیاڵ

ئاخر سفتو ســۆش مەبــۆ وە زوخاڵ

شوانی ٢ ــ پەنا بە خوذا شیعرەکانی خۆشە ... کاك فریاد شیعری مەحبوب جافانم پێ رەوانکە تاکو بۆ فاتەی بێژم .

شوانی ١ ــ بە سەر چاو هەر کاتێ ئەڵێی کاکە محەمەد ئامادەم .

شوانی ٣ ــ براینە شەو درەنگە ئێمەش شوانین سبەی لەو سەرەوە زوو ئەڕۆین ڕانێ لە پەچا دەرئەکەیــن بۆ لــــەوەر . دە هەلسن با بیکەین بە شەو .

( هەموو هەڵئەســن )

( مۆسیقا )

## پەردەی یازدەهەم

( دیوەخانەکەی کوێخا حەمە سوور چەن کەساێـك دانشتوون سەماوەر دانراوە چا دەمی داوە یەکێك گۆرانی ئەڵێ )

مەلا یوسف ــ کوێخا ... ئایا ئەزانی دەنگ‌و باسێ کەوتۆتە نـاو ئاوایی دەربارەی وەلی کوڕت ؟

کوێخا حەمە ــ مەلا یوسف ئەو دەنگ‌و باسە ئەبێ چی بێ ؟!

مەلا یوسف ــ ئەوەی راستی بێ خەڵکی ئەڵێن وەلی دلی بە شەمسەی کوێخا قادرەوە یـە .

کوێخا حەمە ــ تۆ لەو شـتە ئاگاداری ؟

مەلا یوسف ــ لەو رۆژانەی دووابیدا تەماشام ئەکرد زۆر پێکەوە
دائەنیشتن و جارو باریش بە چپە ئەدوان تاکو رۆژێك
گوێم لێ ی بو وەلی وتی ئەگەر تۆ برۆیتەوە من چی بکەم

کوێخا حەمە ــ ئێ ! مەلا یوسف ئیتر چی کە ؟

مەلا یوسف ــ جار جاریش وەلی شیعری ئەوت بۆ شەمسە ... لە
راستیدا شیعرەکانی بەجێ بوون و کورەکەت ئەبێتە
شاعیرێ چاك ٠

کوێخا حەمە ــ مەلا یوسف خەلکی بە زۆری باسی ئەکەن ؟

مەلا یوسف ــ بەلێ بە زۆری باسی ئەکەن ... دووایی کوێخا لەوە
چاکتر هەیە کە وەلی شەمسەی بۆ داوا بکەن ؟

کوێخا حەمە ــ جا چی لەمە چاکتر لە ئێستاکە زووتر نیە
ئەروێن بۆ داخوازی شەمسە .. ئا خێرا کەن برۆن سێ
چوار ریش سپی بانگ کەن لەگەل مەلا یوسفدا
ئەروێن بۆ داخوازی شەمسە بۆ وەلی کورم ٠

خزمەکار ــ ئەمرەکەی گەورەم ٠

کوێخا حەمە ــ مەلا یوسف ، من لەو باوەرەم کوێخا قادر شیروان
شەمسەمان پێشکەش ئەکا ٠

مەلا یوسف ــ بێ گومان شەمسەمان پێشکەش ئەکا ، چونکە کوێخا
زۆر زیرەك و ژیرە ٠

کوێخا حەمە ــ خودا دلی نەرم کا بەلکو ئەو دوو لاوە بۆ یەکتری بن٠

چەن کەسانێك ــ سەلام و عەلەیکم ٠

کوێخا حەمە ــ عەلەیکم‌و سەلام ••• بەخێر بێن ، منیش خزمەکارەکەم ناردە دوواتانا •

مێوانەکان ــ قوربان ئێمە هەر کاتێك دەسمان بگـا سەرت لـــێ ئەدەین •

کوێخا حەمە ــ ئەوەی راستی بێ بۆ ئەوەی ناردمان بە دوواتانا بـۆ کارێکی خێـــر •

مێوانەکان ــ جا لەمە چاکتر هەیە ما شاءالله وەلی گەورە بـووە ••• کاتی ژن هێنانی هاتووە •

کوێخا حەمە ــ زۆر ڕاستە منیش یادم لەوە کردۆتەوە •

مێوانەکان ــ باشە کوێخا بە تەمای داوای کێ‌ی بۆ بکەی ؟

کوێخا حەمە ــ ئایا ئێوە کێتان بە یادا دێت کە داوای بکەم ؟

مێوانەکان ــ ئەوەی ڕاستی بـێ تەنهـــا شـەمســەی قـــادر شیروان ــ ە کە شایستەی وەلی بـێ •

کوێخا حەمە ــ دەمتان خۆش ••• منیش یادم لەوە کردۆ تەوە •

مێوانەکان ــ کە وابو تاکو زووە بڕوێنەوە بـۆ ماڵەوە تـــاکـو خۆمـان ئامادە بکەین بۆ ڕۆیشتن •

( مۆسیقـا )

## پەردەی دوازدەهەم

( دیوەخانی قادر شبێروان چەن کەسانێ دانیشتوون چـــا لێ نراوە ، چـا ئەخورێتەوە چەن کەسانێك جگەرە بە دەسیانەوەیە )

کوێخا قادر ــ ئەمساڵ لە خودا بە زیاد بێ بەهارە کەی چاك ئەبــێ

یەکێك ــ ما شاءالله ... ئەمساڵ باران بە زۆری ئەبارێ .

کوێخا قادر ــ ئەمسال هات بێ دەغلو دانمان باش ئەبێ .

خزمەکار ــ ( دێتە ژوورەوە ) ئاغــام پێنج کەس هاتــن بەرەو ئێرە کوێخا حەمە سوورو مەلا یوسف ــ م ناسییەوە ، بەلاّم ئەو سێ کەسەکەی کەم نەناسییەوە .

کوێخا قادر ــ خێراکەن ئەم ناوە ئاورشێن کەن بــە ماڵەوە بڵێن نــان دروس کەن ، خێرا چاییەکە تازەکەنەوە .

خزمەکار ــ ئەمرەکەی گەورەم ( ئەڕوا ) .

کوێخا قادر ــ ئەم مێوانانە زۆر خوشەویستن ... ئەبێ زۆر ڕێزیان لێ بگیــرێ .

دانیشتوان ــ جا قوربان کەس هەیە ناوی کوێخا حەمە ســـووری نەبیستبێ .. بە تایبەتی پـاش ئەوەی خودا دوو کوڕی پێ بەخشی ... خێرو حەسەناتی لە دونیا نـــــاوی دەرکـــردووە .

کوێخا قادر ــ جا ئێوە وەکو من نازانن ئەو پیاوە چۆن پیاوێـــکە

دانشتوان ــ قوربان ئێمەش ئەیناسین .

کوێخا قادر ــ دەبا هەڵسین بڕۆین بە پیریانەوە ( هەموو هەڵئەسن )

کوێخا حەمە سوور ــ سەلامو عەلێکم .

هاوڕێیانی کوێخا حەمە ــ سەلامو عەلێکم .

کوێخا قادر ــ عەلەیکمو سلامو ورحمة الله وبرکاته یاخـودا بـە خێربێن بەسەر چاوی ئێمە . ( هەر دوو کوێخا یەکتری ماچ ئەکەن ، هەروا کوێخا قادرو مەلا یوسفو هاورێکانی دەسو مۆچ ئەکەن ) . فەرموون دانیشـن .. فەرموون بە خێر هاتن بە سەر چاومان گەورەتان کردین ... کوێخا ئەمساڵ بە هاتنەکەت ئاگادار نەبووین .

کوێخا حەمە ــ ئاگاداری ناوێ من بۆ ماڵی برای خۆم هاتووم .

کوێخا قادر ــ زۆر ڕاستە ماڵی برای خۆتە ... کەس لە عاستی تـۆ خاوەن ماڵ نیە ... تۆ خۆت خاوەن ماڵی .. ئا بڕۆن ئاوی سارد بێنن چاێکەن .

خزمەکار ــ ( ئاوی سارد ئەهێنێ ) فەرموو کوێخا ئاوی سارد •
کوێخا حەمە ــ (ئاوەکەی لێ وەر ئەگرێ‌و ئەیخواتەوە ••• پاشان مێوانەکان ئاو ئەخۆنەوە ).
کوێخا قادر ــ چا بێنن ••• دۆبێنن •
خزمەکار ــ قوربان چا حازرە ئەوا دێت •
کوێخا قادر ــ ئێ کوێخا حەمە ••• ئیش‌و کارتان چۆنە ؟
کوێخا حەمە ــ لە سایەی خوداوە کوێخا قادر زۆر باشە •
( چا ئەهێنن ••• چا ئەخورێتەوە )
مەلا یوسف ــ کوێخا قادر ئێمە هاتوین بۆ خزمەتت بۆ شتێك !
کوێخا قادر ــ فەرموو •• ئەوەی بە من بکرێ بۆ ئێوە بە سەر ئامادەم ئەیکەم •
مەلا یوسف ــ ئەوەی راستی بێ هاتوین لە باخچەکەتان گولێك هەیە پێشکەشمانی بکەی •
کوێخا قادر ــ گوڵی من هەر بۆ ئێوە چاکە ، ئەوا ئەو گوڵەم پێشکەش کرد بە ئێوە •
مەلا یوسف ــ پایەدار بیت کوێخامەمنوونت‌کردین •• هەتا ماوین پیاوەتیت لە یاد ناکەین •
کوێخا قادر ــ گوڵ گوڵی خۆتانە •
کوێخا حەمە ــ کوێخا قادر زۆر سوپاست ئەکەم ••• وەلی هەر چەندە کوڕی منە کوڕی تۆشە •
کوێخا قادر ــ فەرقی نیە بە خودا لە کوڕەکانم زیاتر وەلی ــ م خۆش ئەوێ •

کوێخا حەمە ـ خودا کوڕەکانت لێ نەسەنێ تەمەنیان درێژ کا ...
کوێخا قادر ئەوە هەمووی لێرەیە لەو توورەکەیەدا لە خزمەتایە بۆ شیربایی شەمسە .

کوێخا قادر ـ کوێخا حەمە ... پارە قیمەتی نیە .

کوێخا حەمە ـ کەوا بو ئەوا ( ١٠٠٠ ) لیرە مارەیی شەمسە بێ ئەویش (٥٠٠) لیرە بۆ جلو بەرگو تەدارەکی شایی .

مەلا یوسف ـ کەوا بو کوێخا قادر با مارەی شەمسە ببڕین لە وەلی ئەوا ئێوە هەردوکتان ئامادەن هەر یەکتان وەکیلی منالی خۆیەتی .

قادر ـ فەرموو مامۆستا چی ئەمر ئەکەی من حازرم .

مەلا یوسف ـ ئەوا بە ناوی خوداو پێغەمەرەوە ، بە شاهێدی دانشتوانی ئەم دیوەخانە ... مارەی شەمسەی کچی کوێخا قادر شیروان لە تیرەی کەماڵەیی لە خێڵی جافی مورادیم بڕی لە وەلی کوڕی کوێخا حەمە سوور لە تیرەی کەماڵەیی لە خێڵی جافی مورادی .

( الفاتحة ـ سورة الحمد للەو قل هو الله . ئەخوێنن هەر دوو کوێخا دەس یەك ئەگوشن لە ناو ئاوایی‌دا بڵاو ئەبێتەوە کە مارەی شەمسە بڕاوە لە وەلی ) .

کوێخا حەمە ـ جا کوێخا قادر کەی جەنابت ئارەزوت کرد ئەو کاتە شەمسە ئەگوێزینەوە .

کوێخا قادر ــ چاك وایە کە بەهار خێڵ بەرەو کویستان ئەبێتەوە • لە
شارەزور زەماوەند بگێڕن •
کوێخا حەمە ــ بیرەکەت زۆر ڕاستە ئەوکاتە شەمسە ئەگوێزینەوە بۆ
وەلی ••• شارە زوریش لە سلێمانی‌یەوە نزیکە بە ئاسانی
جلو بەرگی بووكو کەلوپەلی زەماوەن ئەکڕیــن •
کوێخا قادر ــ زۆر باشە •• کوا کوڕم نانتان ئامادە کردووە ؟
کوڕی کوێخا قادر ــ بابە گیان نان ئامادەیە •
کوێخا قادر ــ کەوا بو بیهێنن (نان دێتو دەس ئەکرێ بە نان خواردن)
کوڕم ، نان خورا ، خێرا ئەو نانە هەلگرنو چا بهێنن •
( زڕەی کەوچکی چا دێت کە پیاڵەکە تێك ئەدرێ ) •
کوێخا حەمە ــ کوێخا قادر ئەبێ ماوەمان بدەی بۆ گەڕانەوە •
کوێخا قادر ــ با ئەمشەو پێکەوە بەرینە سەر •
کوێخا حەمە ــ زۆر سوپاست ئەکەم بەلاَم وا بە باش ئەزانم بڕۆمەوە
لەوەیە ئەم شەو میوانمان بێ •
کوێخا قادر ــ زۆرم پێ خۆشە ئەم شەو لێرە بن •
کوێخا حەمە ــ خودا ئاوای کا ••• چاك وایە بڕۆمەوە چونکــــە
کەیخەسرەو بــەگ جەوابی ناردبوو ووتبووی ئەمەوێ
کوێخا حەمە ببینم •
کوێخا قادر ــ کەوا بو دەسەلاَتم نیە بەلاَم زۆر زۆرسەلاَو بکە لــە
کەیخە سرەو بەگ عەرزی ئیحترامم هەیە بۆی •

کوێخا حەمە ــ زۆر سوپاس ... ئیتر خودا حافیز ... کوێخا
هەرکە ماوەم بو سەرێکت لێ ئەدەم .
کوێخا قادر ــ خواتان لە گەڵ ... بە خێر هاتن بە سەر چاو .
( هەموو هەڵئەسن دەس یەك ئەگوشــنو ئەڕۆن )

(مۆســیقــا )

## پەردەی سیازدەهەم

( دیمەنی کەلی پەیکولی‌ی کەلێکی سەختەو ئەکەوێتە کلکەی ڕۆژ هەڵاتی کێوی ( زەردە ) هەموو پاییزو بەهارێک خێلی جافی مورادی لەو کەلەوە ئەچوون بەو دیووا‌و ئەهاتن بەم دیووا •• واتە سەرە ڕێی خێڵ بووەو هەموو ساڵێ دوو جار خێلی پیاتێ ئەپەرێ ••• ) •

قادر شیروان ـ خێراکەن کوڕم لە کەلی پەیکولی ئاودیو بین •

کوڕی قادر ـ بابە گیان ئێمە هەموو حازرین بارو بار گا ئامادە کراوە بۆ ئاوا بوون بۆ ئەو دیو •

قادر شیروان ــ ئێ کەوا بوو بۆچی نارۆن وەستاون •
ڕیش سپیەك ــ کوێخا قادر ••• خێڵی کوێخا حەمە سوور ئەڵێــن ئێمە لە پێشەوە ئاو دیو ئەبیــن •
قادر شیروان ــ جا با خێڵی کوێخا حەمە سوور ئاودیو بن •
کوڕی قادر ــ چۆن ئەبێ ئەوان لە پێش ئێمەوە ئاو دیو بن ؟ •
کوێخا قادر ــ کوڕم قەی ناکا با بڕۆن ئێمەو ئەوان فەرقمان چی‌یە ؟!
(ئەڕۆن ، مۆسیقا )

حەمە سوور ــ هەموو ئامادەن ••• دەبا بڕۆین •
ڕەسوڵ ــ بەڵێ بابە گیان ئامادەین ••• یاڵڵا خێڵ بەرەو کەلــــی پەیکولــی •
مەلا یوسف ــ کوێخا حەمە ••• ڕەسوڵ ــ ی کوڕت ، خەیــاڵــی خەراپە ••• خۆت ئەزانی زۆر لاســارو شــــەڕانی‌و سەرەڕۆیە ••• ئەڵێ ئەبێ خێڵی ئێمە لە پێش خێڵی کوێخا قادر شیروان ، ئاو دیو ببین •

حەمە سوور ــ حەدی چی‌یە قسەی وا ئەکا هەردوو چاوی دەردێنم • ئەگەر لە رووی کوێخا قادر بوەستێ •
مەلا یوسف ــ کوێخا حەمە •• خۆت ئەزانی ڕەسوڵ ــ ی کــوڕت شەرانی‌یە ئەترسم دەسیان لێ بکاتەوە •
کوێخا حەمە ــ نایەڵم هیچ ڕوو نادا ••• دەی کوڕم با خێڵ بڕۆن
( مۆسیقا ، کە هەردوو خێڵ لە یەك نزیك ئەبنەوە لــــە لای کەلی پەیکولی ئەبێتە دەمەقاڵ )

رەسوڵ ــ ئەگەر من کوڕی کوێخا حەمە سوور بم نایەڵم کەس ئاو دیو ببێ پێش خێڵی خۆمان •

کوڕی قادر ــ ئەگەر منیش کوڕی کوێخا قادر شیروان بم •• نایەڵم کەس ئاودیو ببێ پێش خێڵی خۆمان •

رەسوڵ ــ ئێمە ئاو دیو ئەبین‌و کەسیش ناتوانێ دەنگ کا ئەگینا بەم تفەنگە ئاگری ئەدەم •

کوڕەکەی قادر ــ جا ئەگەر تۆ پیاوی ئاودیو ببە •

رەسوڵ ــ من رەسوڵ کوڕی کوێخا حەمەم ئاودیو ئەبم‌و هیچ کەس ناتوانێ رێم لێ بگرێ •

کوڕەکەی قادر ــ ئا دەی بزانم چۆن ئاودیو ئەبی !

رەسوڵ ــ تۆ نایەلی ئێمە ئاو دیو ببین ••• دەها وەرگرە •

( گوللەیەك ئەنێ بە سەر سنگ کوڕەکەی قادر شیروانەوەو ئەیکوژێ ••• گوللەیەکی کە ئەیێن بەو کوڕەکەی قادر شیروانەوە ئەبێ بە تەقە لەم شەڕەدا رەسوڵ ئەکوژرێ لە گەڵدوو کوڕی قادر شیروان ••• پاش تەقەیەکـــی زۆر ••• تەقە کپ ئەبێ ••• مۆسیقایەکی دڵتەنگی ) •

مەلا یوسف ــ کوێخا حەمە ••• ئەمە ئەنجامی کارەکەی رەسوڵـە (بەم جۆرە ناکۆکی ئەکەوێتە نێوان هەردو خێڵەوە ، ئـەم کارەساتە خوێناویە بە جارێ ئەبێتە نا ئومێدی هەتا هەتایی وەلی و گەیشتنی بە شەم ) •

(مۆســـیقا )

## پەردەی چواردەهەم

یەکەم ـ تەماشاکە ئەوە وەلی دێوانەیە لە پاڵ ئەو بەردە دا پاڵـــی
داوەتەوە ، تەماشایکە ڕەنگ زەردو لاواز بووە •

دووەم ـ نەك ڕەنگ زەردیو لاواز بەلکو ئاگای لە زیندەگانـیو
ئاوەدانیی نەماوە ، خووی داوەتە چۆڵو دەشتو دۆڵو
گردو چیاو باسکەو باسکا •

یەکەم ـ بە دووای هەوارگەو ڕەشماڵی قادر شیرواندا وێــــڵ
بـووە •

دووەم ـ وەلی وای لێ هاتــووە ئەگەر دووراو دوور چاوی بـە
شەم بکەوێ ، ئەوە ئەوپەڕی بەختەوەریو چـــــاو
ڕوونییەتی •

یەکەم ـ گوێ رایەڵکە بزانە وەلی شیعر ئەخوێنێتەوە ٠

هەی نائومێـدیی ٠٠٠٠٠٠٠٠

هەی رەنجە ڕۆیی هەی نا ئـومێدیی
هەی یاران چون من بەد بەختێ کێ دی
پــەی هــاڵ نەزانی رووم کــەرد نەبێدی
چۆڵان تەی کەردم ، جە بەڵان یەکــەر
جە ( طەبەس ) تون بیم یاوام وە ( طەبەر )
هەردەی نەجد قەیس ، گشت دام وە پاوە
پەروانە دەستوور ، سەروە سەوداوە
یاوام بەوزامەن ماوای قیبلەم بــی
مەکانو مەسکەن گوزەرگای ( شەم ) بی
هەواران چۆڵ دیم ، زامەن وێرانە
بایە قوش بەستەن جەو مەسکەن لانە
نەدەنــگ دەییار ، نە سەدای یارەن
دەنــگ وێرانەی ( وادی القهار )ە ن
پەرسام ، بایەقوش هامدەرد دەردم
رەفیــقو هامڕاز ناڵەی نەبەردم
من پەروانەی وێــڵ وەڵگەی دامانــم
جانشین قەیس شــای کەم فامانــم
کۆشی کۆچ خێــڵ شــای ( شەم ) جەمینم
گوشادی خاتر خار خەمینــم !
بایەقوش واتش ، پەروانەی کەم فــام
ئیسە ئامانــی وەی ماواو مەقــام ! ؟

کۆچ خێرش کەرد ، لوا وە لەیلاخ
پەی من حەسرەت مەند ، پەی تو ئاخو داخ
وە ئیقباڵ نەحس وێم دامامەوە
نائومێــد جە ( شەم ) هەم ئامامەوە ،
یاران هامسەران ، نائومێد وێــم
هەی عەبداڵ ، بەرِ گێڵ ، دوو جەزێدوێم

دووەم ــ شیعرەکە خۆشە بەڵام بە داخەوە کە وەلی وای لێ هاتووە؛
یەکەم ــ ئەو ( وەلی )یە جوانە تا ئاوهای لێ هاتووە ؟
دووەم ــ گوێ بگرە ئەوا شیعرێکی کە ئەخوێنێتەوە .
وەلی ــ نــە (شەم) جیا من ، . . . . . . . . .

پەروانەی پەشێو ، نە ( شەم ) جیا من
مەجنوون بەد بەخت چارە سیا من

( شەم ) داخ حەسرەت وە دڵ نیا مــن
قەیس ئاسانە خێڵ شــای ( شەم ) مەندە من
وێڵو دەربەدەر فام پەرِگەندە مــن
تەن تەنیا بێ کەس ، یا نەبید مــن
گــم نە گێچ بەحر ، نا ئومیــد مــن
سیاتەر جە سەنگ هەواران مــن
عەبــداڵ بەرِ گێــڵ دیاران مــن
مەنــزڵ نەماوای تون ( طەبەس ) مــن

جەفا وەبێ سوود رەنج وەعەبەس من
عەذاب مەینـەت سەدکـۆ یار من
پەرەی دیـن دۆست ئینتـزار من
چەنی وەحشیان رۆ هامـڕاز مـن
شەو نە ئەشکەنجەی گیـرو گـاز مـن
چەمەڕای رای دۆس لەیلاخ نشیـن من
بە ئەسر حەسرەت دیـدە نەمیـن مـن
هەراسان چە قەوم ، بێزار زێد مـن
دەست نە ( شەم ) بڕیا ، نائومێـد من

تاوە رۆی مەردەن ماتو مەحزوون مـن
سـۆز سەودای عەشـق ( شەم ) نە دەروون من

یەکەم ــ تۆ تەماشاکە بە خودا ئەم شیعرە خۆشە . بە داخەوە بـۆ وەلی ، با بڕۆین بۆ لای .

دووەم ــ چی بڕۆین بۆ لای ... خۆ ئەو ئاگای لە خۆ نیە !؟

یەکەم ــ ئەڕۆین بۆ لای ... تۆزێك دڵی ئەدەینەوە .

دووەم ــ زۆر چاکە فەرموو با بڕۆین ( کە نزیك دەبنەوە بە جووتە هەردووکیان ئەڵێن ) . سەلامو عەلێکم .

وەلی ــ عەلەیکمو سەلام .. فەرموون .. فەرموون دانیشن ... ئێوە کێن ناتاننناسمەوە .

یەکەم ــ وەلی گیان ئەوە بۆ وا ئەکەی ... بۆ لەم چۆڵەدا بە تەنها ئەگەرێی

وەلی ــ چۆن بە تەنها نەگەڕێم ... ئەی تۆ نازانی ئا لێرەدا چی ڕووی‌داوە .

یەکەم ــ بەڵێ ئەزانم ، بەڵام تۆ وا بۆ بە خۆت ئەکەی ؟!

وەلی ــ من تاکو ماوم ئەمە بەشمە ، بەڵام ئێوە نەتان وت کێن ؟

دووەم ــ خەڵکی دێیەکەی ئێوەین .

وەلی ــ یەك تکام هەیە لێتان ئەم شیعرە لە بەرکەن‌و بێگێڕنەوە ئەم نوسراوە شیعرەکەیە .

یەکەم ــ وەلی بە قوربانی چاوەکانت . هەلسە با بڕۆینەوە ماڵەوە ئەی تۆ نازانی دایکت‌و باوکت چییان لێ هاتووە بۆ تۆ ؟!

وەلی ــ گوێ لە شیعرەکە بگرن‌و وەری‌گرن لە بەری کەن .

یاران نە جەرگم ، . . . . . . . .

تیر ( شەم ) ئەم شەو دریا لە جەرگم

بەو خەدەنگ ئاما ئاکام مەرگم

شەهیدم کەفەن مەکەن وە بەرگم ،

تەنیا بە هوون زام جەرگەوە

بسپار دێم وەخاك هوون‌وە بەرگەوە ...

با بەو ئەندام گول ڕەنگیمەوە

پەروانە ئاسا بێ دەنگیمەوە

شوشتەن نەکێلنو هوون زامانم

بەی تەور پەسەند گشت شەهیدانم ،

بەڵام وەسیەتم ئێدەن چە لاتان

هەرچەند کەفتەنان دوور وەڵاتان

بـا گلکۆم ، تەنیـا ، جە رای خێلان بـۆ
نزیـك هەوارگەی سەر رەوێلان بـۆ
میلێ بـە ئەنداز بەژنو بالای ( شەم )
بنیەن جە فەرقم بە بێ زیادو کەم
تاقێ بـە وێنـەی تاق برۆی ئەو
کە سوجدەگاە گیانم بـۆ بە شەو ...
بنویسن بە هـوون جەرگ سەرکەردەم
کە من بەتیر شەست شەم مەردەم ...
پەی چێش ئەو شەمە تاتار چینەن
جە زێـد بێزارەن ، جەبەڵ نشینەن
بەڵکم ئەو قیبلەم جە راگـوزارێ
راش گنـۆ ، وە سەر گلکۆی مـن جارێ
بزانـۆ زەدەی شەسـت وێشـەنـان
داخ وەگڵ بەردە ، حەسرەتکێشەنـان

دووەم ــ وەلی گیان شیعرەکەت جوانە زۆر جوانە بەڵام تۆو خوداو
تۆو سەری شەم ئەگەر لە گەڵمان نەیەیتەماڵەوە .

وەلی ــ باسی شەم ــ ت کرد ئەوا لە گەڵتانا ئەگەڕێمەوە بزانـم
باوکـمو دایکـم چۆنـن .

دووەم ــ زۆر سـوپاس بۆ تـۆ یەزدانی مەزن

وەلی ــ تۆو خودا ئەم شیعرەیش بدەن بە شەم .

یەکەم ــ وەلی گیان ئەو شیعرە کامەیە ؟

وەلی ــ ئەمە ئەو شیعرەیە کە تیایدا ئەڵێم لە کاتی مردنما بــا شــەم
یاسینم بخوێنێ • ئەوە شیعرەکەتان بۆ ئەخوێنمەوە گوێ
بگـــرن •

یەکەم ــ فەرمو وەلی گیان .

وەلی ــ قیبلــەم مەردەنــم ، • • • • • • • • •

ئەمانەت فەرزەن وادەی مەردەنــم
نە حالاّت وەخــت وەسیەت کەردەنــم
نــە ئاکام سەخت گیــان سپەردەنــم
وەسیەتم ئێــدەن شای ( شەم ) روخساران
بەی وە باڵینــم چــون بەینەتداران
بــێ خۆف‌و ئەندێش جەکەس نەکەی شەرم
هۆر دارە پەردەی حجابت بە نــەرم
نەپۆشی جەمین شەمس خاوەریی
بۆ ، وەزانودا چون ئاسمای پەریی
بنیشــە وەبان باڵینــم وەنــاز
بــوانە سورەی یاسیــن وە ئاواز
زوان بــە رێزەی شەکــر رازەوە

بۆ ، وەزانودا چون ئاسمای پەریی
دەنگ وە سەدای خاس وەش ئاوازەوە
جەمیــن وەعەرەق بــۆ گولاّوەوە
گۆنــاو ئەگریجەو زوڵف خاوەوە
جــەو عەرەق نە دەور گۆنــای مەهپارە

جه سەر بتکیۆ گنــووم وه چاره

تادیدەم نــه سەیــر دیدەی سیات بــۆ

نــه زارەی نەزەر وه نــاز دیــات بــۆ

گۆش هەم به سەدای رێزەی رازت بــۆ

بــەو سوورەی شەریف وەش ئاوازت بــۆ

ئەر ســەد جار قابض سزا مدۆ پێــم

هەنێ بنیم‌وه تەنــگ گیان کێشان وێــم

ئەگەر بەو تەور بۆ رۆح رەوانم

بیللاوه ئاســان بەر مشــۆ گیانــم

های چه وەشی مەبــۆ عەمر ومزیندەگیم

نــه خــاك پــای تــۆ بکەردام تەسلیــم

ئەگەر وەتاقی ســەد کۆ گوناحەن

ئینشــەللا بەهەشت هەشتەمین جامەن

( مۆســـیقا )

# پەردەی یازدەهەم

( دیمەنـی دیوەخانەکەی کوێخا حەمە ســوور )

خزمەکار ــ گەورەم کوێخا ئەوا وەلی کوڕت‌و دووکەسی کە هاتن بەرەو ئێـرە •

کوێخا حەمە ــ دەك دەم خۆش کوا وەلی •

خزمەکار ــ قوربان وەرە دەرەوە ئەوەتا هاتن •

کوێخا حەمە ــ یاخوا بە خێر بێن ••• هەڵسن بڕۆین با پێشوازییان بکەیـن •

وەلی ــ ئەوا ئەو خەڵکە بۆ وا ڕا ئەکەن بەرەو لای ئێمە ؟!

یەکەم ــ قوربان ئەوە لە بەر ئەوە ڕائەکەن چونکە تۆ هاتیتەوە .
ئەزانی ئێستاکە چەندە دڵیان خۆش ئەبێ .
وەلی ــ سەیری ئەمانەکەن ... ئەم ڕاکردنەی بۆ چی‌یە ؟!
هەمووان ــ ( ئەبێ بە غەڵبە غەڵب ) وەلی گیان بە خێر بێتـــەو
گەورەمانت کــرد .
وەلی ــ سوپاس بۆ هەموو لایەکتان .

کوێخا حەمە ــ وەلی کوڕم ... وەلی ئەمە تۆی ئاوەرە تووخودا
ورە با تێر تێر ماچت کەمو هەڵتمژم ( زۆر ماچی ئەکــاو
باوەشی لێ ئەدا ) .
وەلی کوڕم هیچ دڵت بە باوکت ناسوتێ ... نازانی من
شەوو ڕۆژم نی‌یە لە بەر تــۆ .
وەلی ــ بابە گیان دەسەکانت ماچ ئەکەم ... بەڵام ؟!

کوێخا حەمە ــ بەڵام چی ؟!
وەلی ــ بابە گیان نازانی چی‌یە ؟
کوێخا حەمە ــ کوڕم خودا گەورەیە ...ڕەسول ــ م ڕۆیشت بــا
توێشم نەڕۆی بە بێ تۆ دونیا تاریکە لە لام ... هێزی
ئەژنۆمی .
وەلی ــ بابە تۆ چۆن بە بێ من ئارامت نی‌یە ، منیش بە بێ شــەم
ئارامم نی‌یە وابزانم ئەمە دووا کاتمە کە ئەمبینی .. چونکە
مردنم نزیکە .
کوێخا حەمە ــ خودا نەکا کوڕم ... خودا نەکا گوێ شەیتان کەڕ بێ .

وەلی ــ بابە گیان کار لە کار ترازاوە بە بێ شەم ژینم تاڵە ٠
کوێخا حەمە ــ کوڕم وا هەوڵ ئەدەین لە گەڵ کوێخا قادرا ڕێــك
کەویــن بۆ ئەوەی شەم ــ ت بدەنێ ٠
وەلی ــ بابە گیان ئەم قسانە بە گوێ منا ناچێ ٠٠٠ دەرمانی مــن
شەمــە ٠
کوێخا حەمە ــ خودایە بیکە بە خاتــری گەورەیــــی خــــۆت و
خۆشەویستی پێغەمبەر ڕەحمێ بکەێ بە حاڵم و حالــــی
وەلی ٠٠ لەم ئاخر پیری یەدا جەرگم نەسوتێنی ٠

وەلی ــ بابە گیان ئەگەر زۆرمنت خۆش ئەوێ ئەو شیعرانەی وتوومە
وني مەکەن ، ئەوا دوو شیعرم لای ئەو دوو زەلامەیــە
ئێستایش ئــەم دوو شیعرە ئەدەمە دەس تۆ .
کوێخا حەمە ــ کورِم کەمێك بە زەبینت بە منو دایکتا بێ بابچین بۆ
لای دایکــت ( ئەڕۆن)

( مۆســــیقا )

## پەردەی شازدەهەم .

( مالی کەیخەسرەو بەگی جاف کە سەرۆکی هەموو خێلی جافو مورادیـــــە )

کەیخەسرەو بەگ ــ مێوانە خۆشەویستەکان ... من بیرم لــــەوە کردۆتەوە کە هۆزی قادر شیروان بخەمە تیرەی رۆغزایی هۆزی حەمە سوریش بخەمە ناو تیرەی هارونی ... بۆ ئەوەی دوور بن لە یەك کوشتن لەمە زیاتر بەسە .

کەسێك ــ بیرەکەت زۆر جوانە جەنابی کەیخەسرەو بەگ .

کەیخەسرەو ــ چونکە بەم دوور کەوتنەوەیە ئیتر ئەوەندە بە یەکترا نەتەقێن‌و خوێن بە خوێن نەشۆن .

کەسێك ــ بە خودای بیرەکەت زۆر جوانە وەکو لە سەرەتاوە وتم .

کەیخەسرەو ــ هەروا داواتان لێ ئەکەم کە ئێوە زوربەی کوێخاکانی تیرەی جاف ــ ن ئیتر نەهێڵن شەو دزی‌و دەس درێژیی دوو هۆزی . کەماڵەیی بەرامبەر بە یەکتر ، جا ئەگــەر ئێــوە لە گەڵمان ئەوە لە ئەمشــــەوەوە بەو شــــتە هەڵئەسیــن .

هەمووان ــ جەنابی کەیخەسرەو بەگ ئەمە شتێکی زۆر چاکەو بــە جێیە ئیتر جەنابت لە سبەیەوە پێی هەڵسە .

کەیخەسرەو ــ زۆر سوپاستان ئەکەم بۆ پشت گرتنتان .

هەمووان ــ چۆن پشتت ناگرین جا جەنابی کەیخەسرەو بەگ ئەمەو درەنگە لای ئێوەمان خۆش .

کەیخەسرەو ــ شەوتان باش هەموو لایەك بە خێر هاتــن .

( مۆســـــیقا )

## پەردەی هەفدەهەم

( وەلی لە پاڵ دار گوێزێکی پاڵی داوەتەوە دوور خستنەوەی هەردوو خێڵ بە ئێجگاری ( وەلی ) لە دیداری شەم نا ئومێد کرد بەم هۆنراوەیە دڵی خۆی ئەدایـەوە ) •

وەلی ــ هەر من ناشـادم ، •••••••
گشت عالەم شادەن ، هەر من نـاشادم
هەر من نە یاوان وەلای هەق دادم
هەر من ناموراد قاپـی موورادم
هەر من بازیی باز نەردەن نە بارەم

هەر من رای شەش دەر بەندەن نەچارەم
هەر من ناسازەن فەلەك وە بەختم
هەر من گیرۆدەی ئازار سەختـــم
هەر من چەرخ چەپ چەنیم وەقینەن
هەر من تالەم پەست خاك زەمینـــەن
هەر من ستارەم سیابی نەســـەر
هەر من فریشتەم کەفتەن دەربەدەر
هەر من ئیقبالـــم خاوێرو خەفتەن
هەر من نەرووی ئەرز رای راسم چەفتەن
هەر من خەمیدەی دەور گەردوونم
هەر من جورعە نۆش جـام مەجنوونم
هەر من پەروانەی پەشێو حـــاڵ جەستەم
هەر من پەڕ سفتەی خەمناكو خەستەم
هەر من چون بلبل یەك فەسڵم وەسڵەن
هەر من سێ فەسڵ عەمرم بێ ئەسڵەن
هەر من رۆی رەوشەن وە دیدەم تارەن
هەر من زیندە گیم چون ژار مارەن
هەر من گرفتار جەور عازاوم
هەر من پەرەی دۆست دیدە لێلاوم
هەر من سزاكێش دوود داخانـــم
هەر من چەمەڕای رای لەیلاخانـــم
هەر من پەرەی دۆست لەیـــلاخ نشینـــم

هاوەختەن بەرشۆ گیـان شیرینـم
تـا ئەو رۆ کە خێڵ مەیانۆ وەدامان
من هام نە سزاو جەور بێ سامان
مەرهەم موشکل گوشاد بدۆم مرادم
وەرنە تا مەردەن خاتـر ناشادم

( هەمان دوو کەس کە لە کاتی خۆیدا چوون بـۆ لای وەلـی گوتیان لەشیعرەکەی ئەبێ ) .

یەکەم ــ ئەم دوور خستنەوەی هەردوو خێڵ بە جارێ وەلی شێت و گێـل کرد ) .

دووەم ــ ئەم دلداری‌یە چی بو ؟! بۆ وای لەم کوڕە جوانە کرد .

یەکەم ــ یارەبـی کـەس توشـی دلـداری نەبێ .. ئەو کەسەی دلداری کردبێ ئەزانێ ... ئەگەر بێتـو رۆژێـك دلدارەکەی نەبینێ گڕەی دەروونی دێ و هەلئەقرچێ .

دووەم ــ گوێ بگرە بزانە وەلی شیعر ئەلێ .

وەلـی ــ هەر من خەمبارم ، .......

هەر من خەمینم ، هەر من خەمبارم
هەر من پەروانەی ( شـەم ) نادیارم
هەر من سەرگەردان زولمـات تارم
هەر من ستارەم جە نەحسی پەسـتەن
هەر من رای شەش دەرنەردم دەربەستەن
هەر من چون مەریخ خارجەن تالـەم
هەر من بەد نامیـم پەخشـەن نە ئـالەم

هەر من کوشتەی تێش عەقرەب ژارەنان
هەر من رسوای دەور ڕۆز گارەنـان
هەر من زیج نەحس کەفتەن وە بەختـم
هەر من سزاکێش ئازاو سەختـم
هەر من دەلـو ئاسانە قەعـر جاهم
هەر من چـون مەجنـون چارە سیاهم
هەر من ئیقبالـم نەرد نەدارەن
هەر من چون فەرهاد کۆکەنیـم کارمن
هەر من فریشتەی دەولەت خامۆشـم
هەر من چون بارام نمەدوە دۆشـم
هەر من جە رای دین بێزاریـم وەستەن
هەر من چون سەنعان زونـارم بەستەن
هەر من جە تانـەی رەقیـب نـاهاڵ
هەر من شادیو زەوق دنیام بێیەتـاڵ
هەر من پەروانەی بەشێـو حاڵەنـان
هەر من شەو تا ڕۆ ( شەم ) خەیاڵەنـان
هەر من جەو سەبەب ستارە خەفەتـم
هەر من ( شەم ) ئا ین نە شەم دوور کەفتم
هەر من وەبێ ( شـەم ) گڕا گڕیـام
زەنگ بەد نامیی نە ئاڵەم زڕیـام
هەر من گشت پەی ( شەم ) خاتـرم ڕێشەن
هەی یاران عیلاج دەرد من چێشـەن !

یەکەم ـ تۆ ئەڵێی چی ؟ وا ئەزانی من هیچ گوێم لە شیعری وەلی نەبووە ؟!

دووەم ـ با بڕۆین بۆ لای وەلی ۰

یەکەم ـ بەڵکو هەوڵی لە گەڵدا بدەین ئەمجارەش بیبەینەوە ماڵەوە۰

دووەم ـ ئای ئەوکاتە کە بردمانەوە باوکی چەندی پێ خۆش بو ۰

یەکەم ـ ئەمجارە زۆر گرانە ۰۰۰ باوەڕ ناکەم بێتەوە لەو کاتەوە هەردوو خێڵ دوور خرانەوە بە جارێ ئەم کوڕە هۆشی نەماوە ۰

دووەم ـ دەبا نزیك ببینەوە ۰۰۰ هەوڵ ئەدەین بەڵکو ئەیبەینە ماڵەوە ۰ ( هەر دووك ئەڕۆن بەرەولای وەلی )

یەکەمو دووەم ـ سەلاموون عەلەیکم ۰

وەلی ـ عەلەیکمو سەلام ۰۰۰ بە خێر بێن ۰

یەکەم ـ وەلی گیان تەندروسیت چۆنە ؟

وەلی ـ شەم باشە ؟

یەکەم ـ شەم زۆر باشە ۰

وەلی ـ منیش زۆر باشم ۰

دووەم ـ وەلی گیان هەڵسە باپێکەوە بڕۆینەوە ماڵەوە ۰

وەلی ـ ماڵەوە ۰! ماڵەوە ۰ ماڵەوە بۆ من نییە ۰
من هاوڕێی ئاسکە کێوییەکانم ۰

دووەم ـ لە بەر خاتری ئێمە با بڕۆینەوە ۰۰۰ خۆت بشۆو جلو بەرگەکەت بگۆرە ۰

وەلی ــ خودا ئیمانتان بداتێ ... لێتان رازی بێ ... بـــــڕۆن
خوداتان لە گەڵ ... ئێرە مالی منە کەلی پەیکولی گۆڕی
منـــە .
یەکـــەم ــ تۆ ئەمجارەش لە بەر خاتری ئێمە وەرەوە .
وەلی ــ هاتنەوە ! .... چۆن بێمەوە ... من لێرە چاوەر وانـــم
بەلکو رۆژێ لە رۆژان شەم بێرەدا تێپەرێ .... ئێوە
بـــڕۆن لە من گەرێـــن .
یەکەم ــ وەلی گیـــان .... مەلا یوسف وتی وەلی ــ م بۆ بێننەوە .
وەلی ــ زۆر زۆر دەستی ماچ ئەکەمو سەلاوی لێ ئەکەم بـــــەلام
تووانای رۆیشتنم نی‌یە .. دیارە ئێوە قوتابی مـــــەلا
یوسف ـــ ن .
یەکەم ــ بەلی ئێمە قوتابی مەلا یوسفین .
دووەم ــ وەلی گیان ئەگەر تووانای رۆیشتنت نی‌یە من ئەتخەمـــە
سەر ئەم وولاخە تاکو دێیـــەکە .
وەلی ــ بڕۆن خواتان لە گەڵ .
یەکەم ــ روحەکەم وەلی گیان .... ئەمرێ ... ئیشێ .
وەلی ــ راوەستە مەڕۆ ئەم شیعرە بدە بە کەیخەسرەو بەگ
یەکەم ــ بە سەرچاو ئەیدەینێ بەلام ئەگەر زەحمەت نی‌یە بۆمـــان
بخوێنەوە .
وەلی ــ بە سەرچاو گوێ بگرن .
خەسرەو خەیـــالێ ، ..........

ئاخ پەی خان خاسێ، خەسرەو خەیاڵێ
ساحب سپاوسان، دارا ئیقباڵێ
موهەییا نەگەنج خەزێنەو ماڵێ
بەخشندەی بێباك، كۆی كەرەم بیا
ساحیب شەوق‌و زەوق دڵ بێ خەم بیا

با ماوە شكار سەر دیاراندا
وە ماوای مەجنوون رۆزگاراندا
بدیاوە جەستەی خەم پێ وارامدا
وەكۆ مای دیوان وەحش سارامدا
وەسەیل ئەسرین دیدەی تارمدا
وە دەرد دەروون ئەندوو بارمدا
وە عوریان تەن تەنیای تاكمدا
وە سەنگ باڵین خەفتەی خاكمدا
وە سەر گەردانیی سارای چۆلمدا
وە ئاساو كەشكۆڵ پۆست كۆلمدا
وە ئاهو ناڵەی شەوان تا رۆمدا
وە زایەڵەی سەخت شین بێ شۆمدا
وە نامورادیی سیا بەختمدا
وە زام بێ شۆ، شین سەختمدا
وە زام پەشێویی بەخت شووم چارەمدا
وە زوخاو زام، چەرگ پارەمدا
وە بڵێسەی بەرز گرتێ بەستەمدا

وه جەستەمی خاتر خار خەستەمـدا
بەزەییش باما وه جەســـتەو حالـم
بزانـاش کوشتەی کامیــن نەوهالـم
جه کێوەن خاتر خەستەم گرتەن خــەم
سفتەو سۆزانم چون ( پەروانه )ی ( شەم )

سەرمایەی عەقلم کێ کەردەن غارەت
کام دلبەر بەردەن وه یەك ئیشــارەت
وەلی ئەو خەیاڵ ( تۆفڵ ) نه دڵ بەرد
گیـان ویش هیلاك ژار قاتڵ کــەرد
نەکەردا ئەو ، ویر ناوەردا ئەو دڵ
نەشــیا نه سەودا یخەیاڵ باتــڵ
یا وەگەنجو ماڵ ، یاوه زۆرویش
شاد کەردا خاتر ( پەروانه )ی دلریش
بکەردا هیممەت چون خــان حاتــەم
( شەم ) واسل وەمن ، من واسڵ وه ( شەم ) ، ...
هەرچەن مەگێلۆن تەی رۆز گاران
کەس نییەن دلســۆز سیاستاران
مەرهەم خوداوەند گوشایندەی بەخت

رەها بدۆ بەخت من جەی بەند سەخت
وەرنە ، ئەی بەندە پا بەند پامەن
تا مەردەن چون قەیس وا حەسرەتامـــەن
دووەم ــ خوا حافیز وەلی گیان ئێمە ئەڕۆین • ئەمرێ ئیشێ ؟
وەلی ــ هیچم ناوێ ••• تەنها هەوالی شەم نەبێ ، خوداتان لەگەڵ •

( مۆســیقا )

## پەردەی هەژدەهەم

(دەنگی پێی ئەسپو ماین حیلکەیان ... عەبدولڕەحمان پاشای بابانو چەن سووارِ چاکێ دێن بەرەو لای وەلی ) .

یەکێك ــ ئەوە وەلی دێوانەیە لە بن ئەو دار گوێزەدا دانشتووە .
عەبدولڕەحمان ــ با بڕۆین لای وەلی بزانین حاڵو گوزەرانی چۆنە .
یەکێك ــ فەرموو با بڕۆین ... ( ئەڕۆن بەرەو لای وەلی لە گەڵ دەنگی پێی ئەسپ حیلکەیان ) .
وەلــی ــ ئەمانە کێــن وا هاتوون بەرەو لای من ؟
عەبدولڕەحمان ــ سەلامو عەلەیکم .

وەلـــی–عەلەیکم‌و سەلام ••• بە خێر بێن •• ئێوە کێن ؟
یەکێك ــ وەلی ، ئەمە عەبدولڕەحمان پاشای بابانە •
وەلی ــ بە خێر هاتن بە سەر چاو گەورەتان کردین ••• قوربـــان
فەرموون ••• فەرموون دانیشن •
عەبدولڕەحمان ــ لە مێژەوە ئەمەویست بێم بۆ لات بزانم حـــاڵ‌و
گوزەرانــت چۆنــە ؟
وەلی ــ ئیتر ئەمەیە حاڵ‌و گوزەرانم کە ئەیینن لەمە خراپتر •

عەبدولڕەحمان ــ وەلی گیان بۆ ئاوها لەم چۆڵ‌و هەردەی ؟
وەلی ــ چۆڵ‌و هەردە بۆتــە جێگای من ••• ئەمە نووسراوە بۆ من •
عەبدولڕەحمان–تۆخۆت وات لە خۆت کردووە •
وەلی ــ من خۆم وام لە خۆم کردووە ؟
عەبدولڕەحمان ــ ئەی گوایە کێ وای لێ کردووی بێگومان خــۆت
وات لە خۆت کردووە •
وەلی ــ ئاگری شەم وای لێ کردووم من شێتی شەمم

یــاران سافێکــم ، ••••••••
لێویاو لێوەی لاڵ سافێکــم
شەیدای شەوق ( شەم ) پەڕ شەفافێکم
کوشتەی نیگای نەز شەخس جافێکــم
خار خــەم نە جەرگ خــاڵ خومارێکم
گیر وە گاز عەشق نــاز تەتارێکم
پێکیــای پەیکان موژان ژارێکــم

سەرسامو سادار پەریی تارێکم
لە رزیای لەرزان ئەحــوالْ تافێکم
کوشتەی نیگای ناز شەخس جافێکم
عەبدالْ بێ بالْ جام جەمینێکم
پەشێو هالْ جەستە دلْ خەمینێکم
ئاشوفتەی دەستەی زۆلف پەڕچینێکم
موبتەلای قیبلەی دنیــاو دینێکم
مایل وە مۆبەت ، بی ئینسافێکم
زامدارو زەدەی دام شەستێکم
زەلیل زامەت زەدەی دەستێکم
رۆح جەتەن پەڕواز موژەی مەستێکم
ئامانج تانەی خاسو کەستێکم
قەیس مەیــل لەیل بــێ خیلافێکم
کوشتەی نیگای ناز ، شەخس جافێکم
فەرهاد شیرین شەکەر ڕازێکــم
نــازاربـاوان ناز ئەندازێکــم
سەیاد دلگیر نەو پەر وازێکم
دام دلْ پارەی دەست بازێکــم
پەروانەی پا بەست کۆ کلافێکــم
کوشتەی نیگای ناز شەخس جافێکــم
ســۆزان ئایــر شــەوق نوورێکــم
شێویای شێوەی ( شەم ) دەستوورێکم

هەراسان نە زێـر زامەن دوورێکـم
قەیس ناوێنـا دیدە کوورێکـم
( دیوانە )ی مەنشوور قـاف تا تافێکم
کوشتەی نیگای نـاز شەخس جافێکم
وێڵ مەینەت مەشـق هەراسانێکـم
گرفتار دۆست خورشید سانێکـم
لێوەی لۆنـگ بۆس خـوم نەشانێکم
دیـرەی لاڵو لەنگ ، بێ زوانێکـم
ئاوارەی ئاهـوو موشکیـن نافێکم
کوشتەی نیگـای ناز شەخس جافێکم

عەبدولڕەحمان ــ بە ڕاستی ئەم شیعرە زۆر کاری تێکردم ، بـەڵام وەلی گیان •• بەم جۆرە نەبێ •• لەم چۆڵو بێ ئابانە •

وەلی ــ گەورەم ئەگەر منت ئەوێو زۆر خۆشمت ئەوێ •• چارەی من لای شەمە •• شەم دەرمانی منە •

عەبدولڕەحمان ــ هەموو تواناو دەسەڵاتم بە کار ئەهێنم بۆ ڕێکەوتنی ئێوەو خێلی شەم •

وەلـی ــ زۆر سوپاس •• بەڵام ••

عەبدولڕەحمان ــ بەڵام چی ؟!

وەلی ــ ئەم شتە زۆر دوورە •

عەبدولڕەحمان ــ خودا گەورەیە هیچ کاتێ بێ بەش مەبە لە گەورەیی خـودا

وەلی ــ نەوەللا من هیچ کاتێ بێ بەش نیم ••• بەلاّم ئەم کـــارە دوورە •

عەبدولڕەحمان ــ من هەولێکی زۆر ئەدەم •

وەلـــی ــ زۆر سوپاست ئەکەم •

عەبدولڕەحمان ــ ئیتر ئێمە ئەڕۆین •• خودا حافیز •

وەلـــی ــ خواتان لەگەڵ لە ئامانەتی خودا دا بـــن •

( مۆسیقـــا )

( هەمـــان جێگاو وەلی لە بن دار گوێزەکەدایە )

وەلــی : سەنگ هەواران ، ......

سەنگ سیا سەنگ سفتەی هەواران
مەلوول ماتەم پەس مەندەی یاران
چــون من هام شەریك دەرد پەژاران
تــۆ سەنگ کۆنی ، یەکـــام هەواران
یە پەی‌ی کێ ڕەنگت ئازیەت بارەن !؟
سفتەی سەودای عەشــق کامین نەو هاڵی‌ی
بێ دەنگو بەد ڕەنگ ماتو مەلاڵی‌ی
تــۆ جە داخ کێ سفتەی سۆزانی‌ی
پەس مەندەی هەوارکامیین هۆزانی‌ی
ڕاس واچە هیجران کێت نە دڵ داخەن
جە هیجران کێ بەرگت قەلا خەن ! ...
ســـەنگ وات سیا بەخت ستەمکێش خەم
پەروانەی پەشێو ، دوور کەفتەی پای ( شەم )
مەر نمەزانی ، لێلاوێت لێڵەن
یــە ئەی جامەسکەن گوزەرگای خێڵەن
یــۆرتو چراگای خێـــڵ جافانەن
جای عەیشو نیشان عەنبـــەر نافانـــەن
هەوارگەی ڕەوێـــل خێڵ موورادییـــن
ماوای شەوقو زەوق زومرەی دلشادییـــن

مـن هەوار ( شـەم ) شای پەروانانـم
خان خاڵخـاسان ، سیا یانانـم
پاییز .. کۆچ خێڵ مەیان وە دامان

تەشریف ماوەران وەی زێدو زامـان
من سفتەی ئەو شەوق شۆڵەی ( شـەم ) چارەم
داخین ئەو نوور سەمەر ستارەم ، .....
ئێـد کە واتش پێـم سەنگ هەواران
من جە ئەو بە تەر لاڵ پیـم جەزوان
زانـام سفتەی شـەوق ئەوشەم روخسارەن
داخدار داخمـای دەست ئەو یارەن
منیچ نە هیجـران شای ( شەم ) روخساران
هاییم وەها مڕەنـگ سەنگ هەواران
تـەن چوێن سیاسەنگ هەواران مـن
پادشـای خەمکێش ، خەمداران مـن

( پاشان خەوی لێ ئەکەوێ لەو کاتەدا ( شەم ) بـە وێـدا تێ ئەپەڕێو زۆر دڵی ئەسووتـێ بۆی ) .

شـەم ــ داخ بۆ تۆ وەلی ... کە وات لێ هاتـووە بریا هەردوو چاوم کوێر ببوایە ، بەڵام بەم جۆرە تۆم نەدیبایە گڕی ئاگری تـۆ دەمسوتێنێ .. بخەوە یاخوا خەو خێرت بێ .

( شـەم ئەڕوا بە گریانەوە )

( مۆسـیقا )

یەکێـك ــ وەلی تۆ خەوتووی ئێستاکە (شەم) تێ پەری
دوعای خێری بۆ ئەکردیو ئەگریـا •

وەلـی ــ کەی تێپەری ؟! ( هەڵئەستێ بە چوار دەورەی ئەسووڕێتەوە )

هەمانکەس ــ نیو سەعات بەر لە ئێستا •

وەلی ــ ئەی دڵ وەسەنگ بای ، ئەی دڵ وەسەنگ بای

ئەی دیدە کۆ بای ، ئەی دڵ وە سەنگ بای
ئەی زوان لاڵ بای ، ئەی خاتر تەنگ بـای
ئەی تەن تاویای ، ژار فەرەنگ بـای
ئەی گۆش نە ژنەواو هەر یەکجار کەڕ بـای
ئەی کەڕ وە غەزەب باد صەرصەر بای
ئەرێ طاڵەی من غەزەب وارۆ لێـت
ئەرێ بەخت من تەوەن وارۆ پێت
ئەی فریشتەی من وەفەرمان حـەق
فریشتان عەرش شەقت کەران شـەق
ئەی ئیقبـاڵ من هەر سەرنگوون بـای
سەر نەنگوون قەعـر ئاو هاموون بای
وێـم بە وێـم وا چـۆن بە کۆی زوخاڵ بـام
مـن نە غەرق بەرق فەنا پـا مـاڵ بـام
چەنـد ساڵەن کە رەنج ، ریاضەت بەردم
هـوون زۆخ زام ریشەی دڵ وەردم
ئـاخ داخـم بی شەوان تاوە رۆ

بوینــۆ بــالآی لەیــل عەنبەر بــۆ
خــاو مەرگم بــێ خــاوم کەردە بــێ
دیــدەم نەخاو بــێ ( شەم ) وە یەردە بێ

( مۆســیقا )

## پەردەی نوزدەهەم

( دوژمنایەتی دوور کەوتنەوەی هەردوو خێڵ کە لە یەکتر جێی ئەوەی نەهێشت کە هیچ کەس بڕوای ، بە یەك گەیشتنی شەم و وەلی ببێ بۆیە ( حەمەمینی رۆغزایی ــ سەرۆکی تیرەی رۆغزایــی داوای ( شەم ) ی کرد بۆ سمایل ــ ی کوڕی ، دەنـــگی پێ ئەســپ و حیلکە حیلکیان تاکو دەنگە کە نزیك مالی قادر شیروان ئەبێتەوە ) •

خزمەکار ــ گەورەم کوێخا حەمەمینی رۆغزای‌یە •
قادر شیروان ــ بڕۆن پێشوازییان بکەن ( حیلکەی ئەسپ و ماین )
کوێخا حەمەمین ــ ئێوارەتان باش •

قادر شیروان ــ ئێوارەتان باش ••• بە خێر هاتن بە سەر چـــاو قادر شیروان •

کوێخا حەمەمین ــ کوێخا قادر ••• شکور باشن ••• تەنـــد روسێت لە چیدایە ؟

کوێخا قادر شیروان ــ سوپاس بۆ یەزدان زۆر باشم •

کوێخا حەمەمین ــ یاخودا باش بیت لە خۆشیدا بیت •

کوێخا قادر ــ کوێخا حەمەمینی حاڵ گوزەراتتان چۆنە ؟

کوێخا حەمەمین ــ ئەی گوزەرێنین ــ سوپاس بۆ یـەزدان زۆر باشیــن •

کوێخا قادر شیروان ــ گەورەتان کردین ••• بە خێر هاتن بە ســەر چاومــان •

کوێخا حەمەمین ــ زۆر سوپاست ئەکەم کوێخا قادر (چا ئەخورێتەوە)
کوێخا قادر خۆت ئاگاداری سمایل ــ ی خزمەکـــارت گەورە بووە •• منیش ویستم ژنی بۆ بهێنم ••• یـادم کردەوە لە شەمسە ــ ی کچت •• جا ئەگەر گەورەمان کەی شەمسە پێشکەش بە سمایل ــ ی خزمەکارت بکەی زۆر سوپاست ئەکەم •

کوێخا قادر ــ ( بە تەبعی مەردانەی ) کوێخا حەمەمین بە خێر هاتن بە سەر چاوم جێی شانازیمە کە یەکی وەکو جەنابت منی کردۆتە سەرو ، داوای کچم لێ ئەکەی •

کوێخا حەمەمین ــ زۆر سوپاست ئەکەم کوێخا قادر •

کوێخا قادر ــ کچ کچی خۆتانەو ... پێشکەشتان ئەکەم ئەگــەر
وەلی تەلاّقی بدا ئەوا بە سەر چــاو ،
کوێخا حەمەمین ــ لە راستیدا من زۆر سوپاست ئەکەم کوێخا قادر
گەورەمانت کرد ... کورِم سمایل هەستە دەستی مامت
ماچ کە ( سمایل هەلئەستیٚو دەسی قادر شیروان مــاچ
ئەکــا ) . جا زەماوەن دووا ئەخەین بۆ ئەوکاتەی کە برِۆین
بۆ کوێستانو وەلی تەلاّقی بــدا .
کوێخا قادر ــ ئەوە ئارەزووی خۆتانە کوێخا حەمەمین .. کــورِم
نان ئاما دەکەن . ئەوا شەو درەنگە . ( نان ئەخوریٚو
چــا ئەخورێتەوە ، ئەو شەوە لەویٚ ئەبن بۆســـبەی
ئەرِۆن )

( مۆسـيقا )

## پەردەی بیستەم

( ماڵی کوێخا قادر شیروان ــ ە شەم دانشتووە لە ناو ژوورێکداو ئەگــــری )

شـــەم ــ ئای لەم بەختە ڕەشەی من ( بەگریانەوە ) خودایە قـــەت ئەمە قەبوڵ نەکەی ... جا من لە دووای وەلی شوو بـــە کێ بکەم ! ... ئەم باخ‌و باخچەیە تەنها قابلی وەلی‌یە .

دایکی شەم ــ شەمسە کچم ئەوە چیتە بۆ ئەگری ؟

شـــەم ــ بۆ نەگریم ! ... ئەگریم بۆ بەختی ڕەشی خۆم .

دایــك ــ کچم ئەوا باوکت تۆی داوە بە سمایل ــ ی کـــوڕی
کوێخا حەمەمین .. کوڕێکی چاك و جوان و نــازدارە .
هەر ئەوەندە وەلی تەڵاق نامەت بۆ بنێریتەوە .
شــەم ــ دایە گیان لێم ناگەرێت .. با بۆ بەختی ڕەشم زیاتر بگریم.
دایــك ــ ئەم گریانە تاکو کەی ؟!
شــەم ــ تاکوو مردنم ... تاکو سەر ئەنێمە ناو قەبر .. تاکو دووا ــ
ڕۆژەی کە زیندو ئەبینەوە .
دایــك ــ کچم ئەم خەیاڵانە لە مێشکت دەرکە .
شــەم ــ خەیاڵ ... خەیاڵی چی ! .. جا تووخودا لە دووای وەلی
من کێم هەیە ؟! بەو خودایەی کە گەورەو بێ مەکانە ..
لە وەلی بەو لاوە کەس سەر ناخاتە سەر سەرینی من .
دایــك ــ کچم ئێمە ئێستاکە دوژمنی یەکین .. چۆن باوکت تــۆ
ئەداتە وەلی .
شەم ــ دایە .. بە گەورەیی خودا لە وەلی بەو لاوە کەس لە باخــی
منا میوە ناچنێ .
دایــك ــ کچم خۆت ئەزانی ئەم دونیایە هەزار وەکو وەلی تێدایــە
تۆزێك یادکەرەوە ئەبینی وێنەی وەلی زۆرە .
شــەم ــ دایە گیان لێم گەرێ با بە دەردی خۆمەوە بتلێمەوە .
دایك ــ کچم کەیفی خۆتــە ( ئەڕوا )

( مۆســیقا )

## پەردەی بیستویەك

( شەو دایکی شەم لەگەڵ باوکی شەمدا قسە ئەکا )

دایك ــ کوێخا قادر •• شتێك هەیە ئەمەوێ بۆتی روون کەمەوە •
کوێخا قادر ــ چی‌یە دایکی شەمسە ؟! •••• خێراکە ڕوونی کەرەوە •
دایك ــ پیاوەکە ••• شەمسە حالی زۆر خراپە شەوو رۆژ ئەگری •••• بە تایبەتی پاش بریاردانت ئەگەر وەلی تەلاقی بدا بیدەی بە سمایل ی کوڕی کوێخا حەمەمین •
کوێخا قادر ــ باشە ••• بۆچی ئێستاکە بۆمی ئەگێریتەوە •

دایـك ــ ئەوەی راست بێ نەم وێرا بۆت بگێڕمەوە •

کوێخا قادر ــ ئەبوایە لە زووەوە بتگێرایەوە •

دایـك ــ تۆ سبەی تەماشای جەستەی شەم بکە وەکو قامیشی لـێ هاتــووە •

کوێخا قادر ــ باشە تۆ قسەت لە گەلیا نەکردووە ؟! •

دایـك ــ بەلێ قسەم لە گەلیا کردووە •• ئەلێ لە وەلی بەو لاوە کەس سەر ناخاتە سەر سەرینم و لە باخی منا میوە ناچنێ •

کوێخا قادر ــ پەنا بەخوا ئەم کچە چەندە وەلی خۆش ئەوێ !

دایـك ــ پیاوەکە ••• تا زووە فریای شەمسە کەوە ئەگینا بــەم زووانە ئەمرێ •

کوێخا قادر ــ لە بەیانی زوو تر نییە شتومەکی سمایــل ــی کوڕی حەمەمین ــ ی رۆغزای ئەنێرمەوە •

( مۆســیقا )

## پەردەی بیستو دوو

( وەلی لەبن هەمان دار گوێزدا لە نزیك بەردەکەدا پاڵــــــی داوەتەوە ) •

پیرێژن ـ وەلی ڕۆلە •••• وەلی کوڕە شیرینەکەم •

وەلی ـ خودا ڕەحم بکا ••• شتێ ڕووی داوە ؟! •••• داپیـــــرە خێراکە بڵێ •

پیرێژن ـ قور بەسەر ••• ئەڵێ ئاگات لە هیچ نییە ؟!

وەلی ـ داپیرە بڵــێ ••• ئایا چی ڕووی داوە ؟

پیرێژن ـ ئەی وەلی هەژار ، قوور بەسەر چی بڵێم •

وەلی ـ ئەیبۆهاتووی پیرێژنی سەر ئاسنین •• ئێوە شـــــوومی سەرن •

پیرێژن ـ داپیره له دەورت گەرێ ... بەڵام .

وەلی ـ بەڵام چی ... داپیره ... چی قەوماوە ؟! هەرچی هەیـە بیلێ ، با نەبێتە بەردێکی تر له سەر دڵما ...

پیرێژن ـ ئەوەی راستی بێ شەم مارە براوە له سمایل ـ ی کوری کوێخا حەمەمینی ـ رۆغزایی .

وەلی ـ قەت نابێ ... ئەمە روو نادا شەم پەیمان شکێن نیـیە . تاکو ئێستاکە من تەڵاقم نەداوە .

پیرێژن ـ کورم ئەرۆم ئاگات له خۆت بێ چۆنت پێ ئەڵێم ئاوهایە .

وەلی ـ ( له بەر خۆیەوە ئەم شیعرە ئەڵێ )

یاران کەردەن رێـش ، .......

یە جەرگ منەن خاران کەردەن رێش

یە دیدەی منـەن زوخاو مەیۆ لێش

یـە دوود منـەن سۆزان دەشتو دەر

یـە ئاه منەن وە ئاسمان یـاوا

سەقف سەراچەی گەردوون شـکاو

یە سەودای منـەن نەفخ صـوور بێزان

وەخت قیامەت مەحشەر ئەنگێـزان

یە ناڵەی منـەن چـون نەی مەدو دەنگ

مەیـۆ ، وە قانون ، مەتاو تۆ سەنگ

یەزاریی منەن پێسە ژگارەن

عـالەم جەزاریی من بێ قەرارەن

یە شیــن منەن شەوان تاوە ڕۆ
چوٚن قەیس مەجنون هام نەبیدو کــۆ
یە وێڵیی منــەن ، جە سوب تا ئێوار
یــە داخ منــەن زاخانو داخــان
داخ کەردەن لالەی هەرد لەیلاخــان
هامسەران وەختەن وادەی مەرگــم بــۆ
من جە دووریی دۆست گولگۆن بەرگم بــۆ

( مۆســیقا )

## پەردەی بیست‌وسێ

( مالی حەمەمین رۆغزایی و چەن کەسایێك دانشتوون )

یەکێك ــ سەلام‌و عەلەیکم •
کوێخا حەمەمین ــ عەلەیکم‌و سەلام ، بە خێر هاتن بە سەر چاوی حەمەمین •
یەکەکە ــ خودا سەلامەتت کا ••• خودا پایە دارت کا •
حەمەمین ــ کوێخا قادر تەندروستی چۆنە •• شکور باشە ؟
یەکەکە ــ زۆر سەلاوی هەبو بۆت ••• ئەلێ ئەبێ لێم ببورێ کە نەمتوانی بێمە خزمەتی ••• ئەمیش شتومەکەکانی

شەمبەیە ... شەمسە زۆر خراپە لەوکاتەوە کە بیستوویەتی
هاتوونەتە داخوازی شەوو رۆژ ئەگری لە بەر ئەوە کوێخا
قادر زۆر سوپاست ئەکاو ئەڵێ لێمان ببورێ .

کوێخا حەمەمین ـ زۆر سەلاوی لێ بکەو هەواڵی بپرسەو هەرگیز
زوێر نابم چونکم کوێخا تووشی شتێکی ناخۆش بــووە
دوو کوڕی کوژراوە لە خێڵ دوور خراوەتەوە .. مــن
هەرگیز لە خەمو پەژارەی ئەودام من زیاتر خەفەت ئەخۆم
تاکو کوێخا قادر شیروان .

یەکەکە ـ زۆر سوپاست ئەکەم . بە راستی ئەوپەری پیاوەتیــــت
نوواند بەرانبەر کوێخا قادر .

کوێخا حەمەمین ـ کوێخا قادر گەورەمانە ... من داوای لێ بوردنی
لێ ئەکەم من هەموو کات ئامادەم خزمەتی کوێخا بکەم .

یەکەکە ـ بە ڕاستی ، بەڕاستی ... بەڕاستی ... زۆر پیاوانــــە
هاتیتە پێشەوە ئەبێ خەمو پەژارەی کوێخا قادر ـ ت

لە یاد نەچێ ؟! جا من داوای لێ بوردن ئەکــــەم ...
ئەمەوێ بگەڕێمەوە .

حەمەمین ـ خوات لە گەڵ زۆر زۆر سەلاو لە کوێخا قادر بکەو پــێی
بلێ من هەمیشە ئامادەم بۆ هەموو یارمەتی یەك کە بە من
بکــرێ .

یەکەکە ـ زۆر سوپاس ... بە دۆعــا .

حەمەمین ـ لە ئامانەتیخودا دا بێت .

( مۆســیقا )

## پەردەی بیستوجوار

کوێخا قادر ــ دایکی ( شەم ) وەرە لە کوێی ؟
دایــك ــ کوێخا قادر ... لێرەم ئێستاکە دێــم .
کوێخا قادر ــ خێرا وەرە بزانە چیت پێ ئەڵێم .
دایــك ــ یاخــوا خێر بــێ .

کوێخا قادر ــ خێرە ... خێرە شەمسە رزگاری بوو.
دایك ــ بەڕاستەوە !؟
کوێخا قادر ــ بەڵێ ... بەڵێ بەراستەوە ... تــۆ وەرە .
دایــك ــ وا هاتم ( دەنگی پێی دایکی شەمسە )

کوێخا قادر ــ ئەمڕۆ میرزا ڕەحیم ــ م نارد بۆ لای حەمەمین باوکی
سمایل ... زۆر جوان ڕێزی لە میرزا ڕەحیم گرتبـووو
وتوبووی .. من لەگەڵ ئازارو ژانەکانی کوێخا قـادر
ئەزانی دوو کوڕی کوژراوەو دڵی بریندارە .. هەرچـی
ئەو بە باشی ئەزانێ من ئەوە ئەکەم .
دایـك ــ شتێکی چاکە ... قەت لەمە باشتر نابێ ... سبەی زوو
ئەچم ئەمە بە شەم ئەڵێم .
کوێخا قادر ــ هەڵسە ئێستاکە بڕۆ بە شەم بڵێ ... من ئـەو کاتـە
کەیف خۆش ئەبم ، کە شەم ببینم کەیفی خۆشە .
دایك ــ باشە کەوا بو ئێستاکە ئەچم بۆ ژوورەکەی شەم تاکـــو
هەواڵی هەڵوەشاندنی شو کردنی بە سمایل ــ ی حەمەمین
پێ ڕاگەیەنـم .
دایك ــ شەمسە ... کچم شەمسە ... نووستوە یا خووا خـــەو
خێرت بێ ... شەمسە ... کچم شەمسە .
شەمسە ــ بەڵێ ... بەڵێ دایە گیان .. شتێ رووی داوە بەم نیوەشەوە
هاتووی ؟!
دایـك ــ ( بە پێکەنینەوە ) ئەی چۆن شتێ رووی نەداوە زۆر شت
رووی داوە .
شەمسە ــ هەرچی رووی دابێ بە من چی ؟!
دایـك ــ چۆن بە تۆ چی .. هەموو شتێك پێوەندی هـەیە بـــە
تۆوەوە .

شەمسە ــ دایە گیان •• پێوەندی بە منەوە هەیە ؟! دە فەرموو دایــە
گیــان قسەم بۆ بکە خێراکە •
دایك ــ کچم ••• ئەو رۆژەی ڕازو نیازی خۆتت لە لای من باس کرد
••• منیش بۆ شەوێ هەموو شتێکم بۆ باوکت گێراوە ••
باوکت بۆ سبەینێ کە لە خەو هەڵسا ناردی بە دووای
میرزا رەحیم‌داو ناردی بــۆ لای حەمەمینی باوکی سمایل
ئەویش زۆر بە پیاوانە وەڵامی دابووەوەو وتوبوی ئــەوا
ئیتر باسی شەمسە ناکەین‌و داوایشی ناکەیــن •
شەمسە ــ ئۆخەی خوایە هەزار جار سوپاس ••• هــەزار جــار
ســوپاس •
دایــك ــ کچم ئیتر گریان بەسە ••• تۆ لە ئاوێ نەدا تەماشای خۆت
بکە بزانە چیت لێ هاتووە نەماوی •
شــەم ــ تاکو ئێستاکە ئەگریام بۆ بەختی ڕەشی خۆم کە باوکــم
بەڵێنی دابو کە من بدا بە سمایلی حەمەمین لەمــەولا
ئەگریم بۆ وەلی •
دایــك ــ خودا گەورەیە ئەویش جێ بە جێ ئەبێ •
شەمسە ــ کووا خودا لە دەمت بیبیستێ‌و بیکا ••• ئایا ئەگەم بەو
رۆژە •
دایــك ــ کچم خودا گەورەیە ••• پشت بە خودا ببەستە •

شەمسە ــ دایە گیان بە قوربانی خودا بم بەلاّم ئەم کارە زۆر دورە .. منو وەلی بگەین بەیەك •

دایك ــ ئەم شەو بخەوە خودا لە سۆلتان مەحمود گەورە ترە ... کچم شەو درەنگە من ئەڕۆم ئەخەوم •

( مۆســیقا )

## پەردەی بیستوپێنج

( مالی مەلا یوسف )

یەکێك ــ سەلامو عەلەیکم .

مەلا یوسف ــ عەلەیکمو سەلام ... فەرموو ... یاخودا بە خێــر بێت ... فەرمو دانیشە

یەکێــك ــ تەندروستیت چۆنــە ؟

مەلا یوسف ــ زۆر باشم سوپاست ئەکەم .

یەکێك ــ دوێنێ وەلی ــ م بینی ... بەڵام بریا نەمدیبایە .

مەلا یوسف ــ بۆچی ! .... چۆنت بینی ؟

یەکێك ــ مامۆستا زۆر هەوڵم دا ... لە دووایدا وتی لەم رۆژانە دا دێم سەرێك لە مامۆستام ئەدەم .

مەلا یوسف ــ باسی ئەوەت بکردایە کە شەم مارە بڕینەکەی درۆیە
هێشتا بە پێی شەریعەت هەڵاڵی ئــەوە کەیخســەرەو
بەگ‌و پیاو ماقوڵانی جاف هەولی ئەوە ئەدەن بۆ یـــەك
بوونی هەردوو هۆز واتە هۆزی حەمە سوور باوكـــی
وەلی‌و هۆزی قادر شیروان باوكی شەم •
یەكێك ــ ئەم شتەم پێ گەیاند ••• دلی وەلی ڕا نەچەلەكان : ئەوا
دەنگی وەلی بە دیارە هاتووە بۆ خزمەتت‌و شیعر ئەڵێ •

وەلــی ــ وەخاڵ تۆوەن ، ••••••

نوور لقــای حەق وە خــاڵ تۆوەن
شۆڵەی شەم وە شەوق جەمــاڵ تۆوەن
دەردینان وە داخ کەمــاڵ تۆوەن
( لەیلا ) کە نیزەك ، ( شیرین ) بەندەتەن
( هومەیلا )ی زەرین ، ( بەلقیسا )ی باڵدار
( گوڵشا ) ( گوڵ ئەندام ) ( عوزرا ) ( گۆلعزار )

یەکــا یەك حەیــران بەژن‌و باڵاتــەن
بــاڵا نەو نەمام ، سەوڵ ئاڵاتــەن
( دڵ ئارام ) دڵ ، ( سەمەن بۆ)ی پەری‌ی
( مەنیجە )ی بێژەن ( زوهرە )ی موشتەری‌ی
( خەرامان ) حەیران حوسن زێباتــەن
بانــوان تەمــام گشــت جانفداتــەن
حووران جەنــەت ، فریشتان فەرش

سەنـا خواتتـەن جەزەمیـن تاعەرش ما
گـوڵ جە گوڵستان وە داخ تۆوەن
داخـداران وەداخ دمـاخ تـۆوەن
هەرچەند پەروانان هەن جە ساراو کـۆ
گشت ماتـەن جە شەوق شـەم ئەفرۆز تـۆ
من چـون پەروانان هەر جانفـدای تـۆم
حەیـران جەمیـن بـەزم ئارای تـۆم
وە سەر گەردت بـام شـای سپـی شەمـان
سەرگەردان تـۆم ، دوور جە هامدەمـان
بەشـق خـاڵ وێـت خاتـر شـادم کەر
یـارو خسەت ، یا مەرگ ، یا ئازادم کەر ،
ئیسـە بـوو ، چەنیـم لا دێ سازابـە
جەی گشت عازابـە گەردەن ئـازا بـە

مەلا یوسف ــ ئەی بەخێر بێیت وەلی گیان ... بـە سـەر چـاو
( ئەم لاو ئەو لای وەلی ماچ ئەکـا )

وەلی ــ (دەسی مەلا یوسف ماچ ئەکا ) دەسەکانت مـاچ ئەکـەم
مامۆستا گیـان ... ئەحواڵت چۆنە ؟

مەلا یوسف ــ من زۆر باشم ... ئەی تۆ چۆنی ؟ ئەوە وەلی گیان
مامۆستاوقوتابی ئاوها ئەبێ ! نە سەرمان لێ ئەدەی نـە
هەواڵمـان ئەپرسی .

وەلی ــ مامۆستا من لە هەواڵا نەماوم .. ئەگەر تـۆم خۆش نەوێ
یەکسەر نە ئەهاتـم بۆ لای جەنابـت .

مەلا یوسف ــ ئەزانم منت خۆش ئەوێ •• ئەی وەلی گیان تــۆ
نازانی من چەندە تۆم خۆش ئەوێ •
وەلی ــ زۆر سوپاست ئەکەم مامۆستا •
مەلا یوسف ــ کوڕم هەڵسە خۆت رووت کەرەوەو ئەم جلو بەرگە
فڕێ دە ئەوە لە ماڵەوە ئاوت بۆ گەرم ئەکەن خۆت بشۆ
جنلەکاتیش ئەشۆن •
وەلی ــ خۆم بشۆم !•• خۆم ناشۆم هەر ئێستاکە ئەگەڕێمەوە •
مەلا یوسف ــ کوڕم خۆت بشۆو جلی جوانو تازە لە بەرکە چونکە
کەیخسەرەوو کوێخا ریش سپیەکانی جاف هەموویــان
کەوتوونەتە بەینەوە بۆ ئەوەی باوکتو کوێخا قادر شیروان
ئاشت کەنەوە ، بەم ئاشت بوونەوە شەم ئەدەن بە تــۆ •
وەلی ــ مامۆستا کار لە کار ترازاوە ، ئەمانە هیچیان دادی من نادا •
مەلا یوسف ــ وەلی گیان هەرچیم لە توانا دا هەبێ بۆت بە کار
ئەهێنــم •
وەلی ــ مامۆستا زۆر سوپاست ئەکەم •
مەلا یوسف ــ وەلی بۆچی ئاوها لە ژین وەرسی •
وەلی ـ مامۆستا ئەڕۆم •
مەلا یوسف ــ کوڕم با ئەم شەو پێکەوە بیــن •
وەلی ــ مامۆستا ئەڕۆم بۆ کەلی پەێکولێ •
مەلا یوسف ــ وەلی گیان رەنجووری شاعیر کە خەڵکی کەرکووکــە
ئەم شیعرەی بۆ ناردووی •
وەلــی ــ مامۆستا ئەو شیعرە کامەیە ؟

مەلا یوسف ـ ئەوەتا ... وەری گرە .

وەلی ـ مامۆستا چاوم بە تەواوی نابینــێ بەڵکو جەنابــــت بیخوێنیتەوە .

مەلا یوسف ـ

(میرزا)ی خاس خەیاڵ ، ......

میرزای خولاســەی خاس خاس خەیاڵ

دانای دورِ شناس کــان کۆی کەمــاڵ

ســەرِاف بێ لاف ، با خەبەر جەحــاڵ

شوعەرای سینە ساف ، گەنجینەی ئەبیات

بەیــتو فەرد شیرین ،( شێخ سەعدی ) سیفات

جا نشیــن نەجای ( حاجی ) جەوهەر بــار

جەواهر فرۆش ســەر چەشمەی ئەشعار

لێوەی لەب لاڵ لەیلا بەینەتــان

شەیدای شێوەی ناز شیرین خەسڵەتــان

سەراو زەمیــن پاك دڵ ئاوێنە تــەور

قەیس قەدیــم ســاڵ ، نادرەی رووی دەور

زام زەدەی هیجران ، دڵ کوورەی شەرار

ئەی حەرفە واتــم جەلات بــۆ ئیظهــار

زیــاد نە زومرەی ســاحب کەمالاّن

ئارەزووی تۆمــەن ، ، وەشای عەودالاّن

دایــم هەر تەحسیــن کەلام تۆمــەن

فەردت فەروەح بەخش دڵەی خەم خۆمەن
( خالـق الاشياء ) ئاگای هەر حاڵەن
هەر یەند تاسەی تۆم دایـم خەیاڵەن
هەرکەسێ مەیـۆ نەو راگەو جێوە
بەو مولکو مەکان نـام تـۆ پێـوە
تاقی پێش ماچۆن پەرەی جستو جـۆت
پیـم بارۆ ئەحواڵ جەستەی خەمبێ شۆت ،
بەلـێ میرزای خاس عاقیبەت وە خێـر
تـۆ جەبارەی من هیچ نەداری مێـر
هیچ نمـە پەرسی جارێ نە جەستەم
جەستەی پەشێو حـاڵ سەرتاپا خەسـتەم
ئومێدەن ( میرزا ) ( من بعد الايام )
نامەی ئینشـای تـۆ کەم نەبـۆ جەلام
دایـم یـادت بۆ پەرێـم بکیـانی‌ی
ئاداب تەرتیـب یەك رەنگ بنمانی‌ی
پەی جێش وە نامت دڵ مەبو گوشاد
یاد ئاوەری کە ، تا نەشی‌ی وەیـاد

جەی وەرتەن یاران وە یەردی ئەییام
یاد کەردەن یاران ، باقی وە سەلام ؛
وەختێ فیکـر تـۆ ئاوەردم وە هـەم
عەمـرم یاوا بێ وە پەنجا پەنج کـەم
جە سەنەی هەزار دوو سەدوو نـۆدا

نامـــەت وەی تەورە لای بەندە رۆدا
( رەنجووریی ) م ، رەنجوور ما جرای دینیـــام
پەی جەواب نامەی فەردت چەمەڕام

وەلـــی ــ زۆر سوپاسی مامۆستا رەنجووری کەرکووك ئەکـــەم بۆ
ئەم شیعرەی هەروا سوپاســـی جەنابتیـــش ئەکـــەم کـــە
خوێندتەوە •

مەلا یوسف ــ هیچ ئەم لاو ئەو لای ناوێ ئەبێ بڕۆین بۆ ماڵی باوکت
وەلی ــ مامۆستا ناتوانـــم •
مەلا یوسف ــ وەلی گیان وا دیارە خاتری من ناگری •
وەلی ــ خاتری تۆ لەسەر هەموو خاترێکەوەیە •
مەلا یوسف ــ کەوا بو با بڕۆین بۆ مـــاڵ باوکت •
وەلی ــ فەرموو با بڕۆویـــن • ( ئەڕۆن ) •

( مـــۆسیقـــــا )

( دیوەخانی کوێخا حەمە سوور و چەن کە سانێ دانشتوون )

مەلا یوسف ـ سەلامو عەلەیکم .

کوێخا حەمە ـ عەلەیکمو سەلام ... ئەوا وەلی لە گەڵتایە ( ئەم لاو ئەو لای وەلی ماچ ئەکاو .. وەلی ـ ش دەستی باوکـی ماچ ئەکـا ) .

کوێخا حەمە ـ وەلی کورم برۆ ماڵەوە با دایکت چاوی پێت بکەوێ دەسێ جلی تازەم بۆت، کڕیوە خۆت بشۆو لە بەری کە .

وەلی ـ ئەچم بۆ لای دایکم بەڵام جلم ناوێ .

کوێخا حەمە ـ نابێ لە بەری نەکەی کورم ... لە زووەوە بۆتـم کڕیوە ، ئا وەرە ( بە خزمەکارەکەیان ) قالە .. قالە بیبەرە ماڵەوە با دایکی بیبینێو خۆیشی بشوا .

خزمەکار ـ فەرموو وەلی گیان ( ئەڕۆن ، مۆسیقا )

کوێخا حەمە ـ مەلا یوسف هەندێك وەرە سەر وەلیدا بە قسەی تۆ ئەکـا .

مەلا یوسف ـ کوێخا من بیست ئەوەندەی تۆ خەفەتی بۆ ئەخـۆم زۆریش هاتوومەتە سەریا ... بەڵام خۆشەویستی ... شەم وای لێ کردووە هیچی لە یاد نەماوە . تەنهـا شـەم نەبێ ... ئەوەی راستی بێ تاکو رۆژێ زوتر شەمـی بۆ بێنی کەمە .

کوێخا حەمە ـ ( هەناسەیەك هەڵئەکێشێ ) چۆن رێك کەویـن .. پاش چی پاش کوشتن ... پاش کوشتنی رەسوڵ ـ ی

کوڕم و دوو برای شەم ٠

مەلا یوسف ــ کوێخا ڕێك کەوێ ، ڕێك کەوتن لەسەر هەمـــــوو شتێکەوەیە ڕەسوڵ مرد ٠٠ باوەلیش نەمرێ ٠

کوێخا حەمە ــ زۆر ڕاست ئەکەی بەڵام چی بڵێم ! ٠٠ ئایا هەوڵ و تێکوشانی کەیخسەرەو بەگ و ریش سپیەکانی بۆ گێڕاوە ٠

مەلا یوسف ــ بەڵێ هەمووم بۆ گێڕاوە ٠٠٠ بەڵام هیچ کـــاری تێ نـەکـرد ٠

( مۆسـیقا )

## پەردەی بیستو شەش

( مەلا یوسف لە سەر هەوڵو تەقەلای خۆی بەردەوام بــو ، بەڵام پاش چی کار لە کار ترازا بوو ، زەردو لاواز ، مووی سەرو ریشو ســمێڵ هاتوو ، چلکــنو کولکن ، شڕو وڕ ، تینوو برسیو بە سەر هەردەی کەلی پەیکوڵی دا .. دیمەنی ماڵی کوێخا حەمــە سووری باوکی دێوانەو مەلا یوسف ناسرا بو بە (مەلا وێسو لەگەڵ چەن کەسێکدا دانشتوون چا ئەخۆنەوە ) .

*

کوێخا حەمە ــ مامۆستا مەلا یوسف حەز ئەکەم چاووم بە وەلــــی بکەوێ چونکە لەوەتی ڕۆیشتووە نەم بینیوە ، کــــە رۆیشت حاڵی بــاش نەبو .

مەلا یوسف ــ بە ڕاستی ئەڵێن دڵ ئاوێنەی دڵە من ئەمەویست وەها بڵێم ... لە راستیدا ئەم شەو خەوم بە وەلی‌یەوە بینیوە با بڕۆین سەری لێ بدەیــن •

کوێخا حەمە ــ ئایە ... ئەبێ لە کوێ بێ ؟

مەلا یوسف ــ بێ گومان لە کەلی پەیکولی‌یە ، لە ژێر دار گوێزەکە دا دانشــتووە •

کوێخا حەمە ــ ئەو کەسەی ئەیەوێ وەلی ببینێ هەڵسێ با بڕۆیــن بۆ لای •

هەمووان ــ قوربان کوێخا ئێمە هەموومان ئەمانەوێ وەلی ببینین •

کوێخا حەمە ــ دەفەرموون هەڵسن با بڕۆین لە ئێستاوە • ( هەموو ئەڕۆن بۆ لای وەلی ، تاکو ئەگەنە نزیك وەلی)

( مۆسیقـا )

وەلــی ــ حاڵم زۆر پەرێشانە ئەمرۆ ئەمرم •• روح دەرناکەم •• کێ شیعرەکەم ئەدا بە رەنجووری کەرکووك ؟

مەلا یوسف ــ وەلی گیان ... دیدەی راستم ... من شیعرەکەت ئەبێــرم بۆ رەنجووری کەرکووك •

وەلی ــ ئەوە کێیــە ؟ !

مەلا یوسف ــ وەلی •• قوتابی‌یە زیرەکەکەم نامناسیتەوە مــن مەلا یوسف ــ م •

وەلی ـ مامۆستا هێزم نەماوە .. ئەی ئەوانی کە کێن ؟
کوێخا حەمە ـ وەلی کوڕە شرینەکەم .. من باوکتم نامناسیتەوە .
وەلی ـ بابە گیان ... بە خێر هاتی بە سەر چاوەکانـم .
کوێخا حەمە ـ وەلی بە قوربانت بم ، ئەوە بۆ وات لێ هاتووە ؟!
وەلی ـ بابە گیان ئەمڕۆ روحم دەرئەچێ .. زۆر باش بو هاتن بـە جێم مەیەڵن ئەمڕۆ ئەمرم .
کوێخا حەمە ـ خودا نەکا گوێ شەیتان کەڕ بێ .

وەلی ـ مامۆستا مەلا یوسف بە زەحمەتی مەزانە ئـەم شیـــعرە بخوێنەرەوە کە وەڵامی نامەکەی رەنجووری کەرکووکە .. نە وەك هەڵەم کردبێ چونکە لە کاتی نوسینەوەیدا زۆر نەخۆش بـووم .
مەلا یوسف ـ بەڵێ ئەوا ئەیخوێنمەوە ... فەرموون گوێ بگرن .

مەولای لاڵ شناس ، . . . . . . . . .

مەولای ( رەنجووریی ) دانای لاڵ شوناس
( هەیاس ) دورِ ناسِ ئەسڵ و نەسب خاس
نەژاد پاکـان ( نیظامی ) قیـاس
( فەردوسیی طوسیی ) جامی مەلەك جام
( خاقانیی ) خەیاڵ ( ئەنوەریی ) ئەیـام
( سەعدیی ) سوخەنخوان بەحریی مەعانیی
( حافظ )یی شیر از ( صائب ) ثانیی
بەتای بێ هەمتای قەیوومی بێ چـون

هامتای تۆ کەمەن نەرووی دەور دوون
( شەوکت ) خۆشەچیـــن بەحر مەعناتەن
( عصمەت ) نە ئەوساف سیفاتت ماتــەن
( مولانا ظهیر ) ( فاریــای ) دەور
فوضەلای فاضل نادرەی خۆش تەور
هەنیی چەن شوعەرای ( ئاصف ) نیشانان
دەرس نەمەدرەســەی علــم تــۆ وانــان
غەواصی محیط دریای علوومی
شیعری مەثنەویــت مەر ( مەولای روومی )
تۆ شەللاهەنــی پایــەت بۆ زیــاد
من چیشـــم کەنام من ئاردیی وەیــاد !
غەیرەز هەر ئینــەن بزرگیــت کەردەن
نام بەندەی وێت باد ئاوەردەن
ئەلبەت وێت وەحاڵ پەشێوم زانای
جە رووی مەرحەمەت نامە کیانای
کە ردەنــت ئیظهــار مەولای کەرەم سەیل
تۆ ســاحب لوتفیی ، یانی من بێ مەیــل
مــن قسەم وەزا ت ئەوکەس یەگانــەن
دایـم نام تۆمو ییرد زوانــەن
هەر چەندە خزمەت تــۆ ئاشنانیــم
وەلێ جە ذکرت لادیی جیا نیــم
دڵ پەروانە وار جە شــەو وە رۆ

هەر هانە خەیاڵ وەسڵ دیــن تــۆ
مەکە هام   تەرکیــب عەمرم نــام تــۆن
نیشــات زەینــم کۆی کەلام تــۆن
نادیدە حوبیت جا گرتــەن نــە دڵ
هەرگیــز نــە سەودات دڵ نیــەن غافــڵ
کەلامت سەر مەشق ئینشای زەینمەن
نامت بینایی‌ی هەردوو عەینمەن
لاتە شبیە چون وەیس رەمیدەی ڕەسوول
هەر هام نە خەیــاڵ وەسلت کەم‌و سوول
ئەوا بــواچی ئەو زامەن دوورم
( دیوانە )م بەندەی مەولای (رەنجوور)م

وەلی ــ مامۆستا دەم خۆش ... شیعرەکەم باشە خراپ نی‌یە . ئایی
... ئــایــی

کوێخا حەمە ــ ڕۆڵە وەلی چیتە ؟ بۆوا ئەکەی ؟
وەلی ــ بابە گیان ژیانــم تەواوە ئیتر نا ژیم .. دوعای خێــرم بۆ
بکــەن .

کوێخا حەمە ــ دوعای چاکان بێ بۆ تۆ بێ .. یا ڕەبی ئەو دەردەی
بۆ تۆ دێ ڕوو لە من بکــا .
مەلا یوسف ــ ئادەی بەولاوە ئەوا شەم هات .
وەلی ــ شەم ... شەم .. م .. م م کوا شەم ؟! چرای دیوەخانم ،
شــەم ! مامۆستا کواشەم ؟

مەلا یوسف ــ ئەوەتا شەم .. ئەواتا گەیشت .

شەم ــ وەلی ڕوحی رەوانم .. بینای دیدەم هێزی ئەژنۆم ( بــێ پەروا لە خەڵکەکە سەری وەلی ئەخاتە سەر ڕانـــی ئەیلاوێنێتەوە ) .

وەلی ــ شەم روحی رەوانم چۆن هاتی ؟!

شــەم ــ چەن رۆژە دڵــم بێ ئارامە لە بەر تۆ .. ئەمڕۆ بەیانی زوو هەڵسامو بریارم دا بێــم بۆ لات .

وەلی ــ ئەی قسەی خەڵکــی ؟!

شــەم ــ هەرچی ئەبێ با ببی من پەروام لە قسە نەماوە .

وەلی ــ شەم بینای دیدەم .. من ئەوا تەواو ئەبم لە یادت نەچــێ خۆت یاسینم بخوێنە ( لەم قسانەدا ئەبێو ئەمری . مەلا یوسف چاوی وەلی ئەبێتە یەك ) .

شەم ــ ئای هاوار وەلی خۆشەویستم ڕۆ .. ئەی براڕۆو باوکە ڕۆو وەلی نازدارم ڕۆو ( خۆڵو خاکی ئەوناوە ئەکا بــە سەریا) ئای هاوار وەلی ئیتر من دووای تۆ چۆن بژیم .. دنیام لە لا تاریکە .. خۆشەویستەکەم وەلی یە جوانەکەم. تاقانەی جوانی جاف دەك ئەوەی وای لێ کردین جەرگی کون کون بێ ، ئازیزی لە ناوچێ ( بەقایم ئەگری ) ئیتـر من چی بکەم ڕۆڵە کێ بکەم ئەو روناکی‌یەم هەبو ئەویش وا نەما ... ( ماوەیەکی زۆر ئەیلاوێنێتەوە )

مەلا یوسف ــ شەم کچم گریان دادمان نادا .. تکام وایە یاسینــی بخوێنی چونکە بریاری خۆی بووکە تۆ یاسینی بخوێنــی.

شەم ــ یاسینی ئەخوێنم ( دەس ئەکا بە یاسین خوێندن تاکو تەواو ئەبــێ ) .

کوێخا حەمە ــ باوکە ڕۆو... برا ڕۆوکوڕی شرینم ڕۆو... وەلی گیان بریا ڕوحی من دەر چووایە نەك ڕۆحی تۆ ... ئای وەلی چۆن جەرگمت بڕی .

مەلا یوسف ــ ئەمە کاری خودایە کەس ناتوانێ هیـــچ بلـێ ... هەموومان ئەمە ڕێگامانە ئەمرۆ نەسبەی ... هەڵسن ناوی خودا بێنن با وەلی بەرینەوە بــۆ ئاوایی‌و تاکــو بیشۆین پاشان ئەبێ لەم جێگەیە بنێــژرێ چــونکە خــۆی وا بڕیاری داوە .

هەمووان ــ یا ئەڵلا دەی فەرموون با وەلی ببەینەوە ( وەلی ئەخەنە سەر وولاخێ ئەکەونە ڕێگا بەرەو ئاوایی .. کە نزیکی ئاوایی ئەبنەوە ، لە نــاو ئاوایی بــڵاو ئەبێتــەوە کە وەلی ئەمری خودای کردووە ئەبێ بە شین‌و گریان‌و واوەیلا ).

کۆتــایــی

تێبینی :

١ ـ سوودم وەرگرتووە لە کتێبەکەی مامۆستا عوسمان هەورامی‌ی ( وەلی دێوانــە ) •

٢ ـ هەروا سوودم وەرگرتووە لە ( رۆشنبیری‌ی وەلی دێوانە )ی مامۆستا محمد امین هەورامانی هەرچەندە جیاوازییەکــی زۆر هەیە لە نێوان ڕای هەردوو مامۆستادا دەربارەی ژیانــی وەلی دێوانە ، بەڵام من سوودم لە هەردوك وەرگرتووە بــە پێ‌ی شانۆگەرییە کە •

٣ ـ زۆر سوپاس خوشکە خالیدە ئیبراهیم شەوقی ئەکەم کە دەقی شانۆگەرییەکەی بۆ نوسیمەوە •

الجمهورية العراقية
وزارة الثقافة والاعلام
ر الثقافة والنشر الكردية
سلسلة المسرح
( ٥ )

# ولى ديوانه وشم

محمد عبدالرحمن زه نگنه

تصميم الغلاف : عبدالقادر علي مردان

السعر ... [illegible]